حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پەروەردەی ئیسلامی

## پۆلی حەوتەمی بنەرەتی


ئامادەکردنی

عبداللە عبدالرحمن بابان | واحد حمە صالح حسین | عبدالجبار حمە شریف
ئازاد عمر سید احمد | خواجە طە شاهین | صادق عثمان عارف

پێداچوونەوەی زانستی

د. بشیر خلیل توفیق | أبوبکر علی کاروان

وەرگێرانی بۆ سەر زمانی کوردی

صادق عثمان عارف

پێداچوونەوەی زمانەوانی

سادق ئەحمەد عوسمان روستایی



چاپی یەکەم

١٤٣٦ کۆچی ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی



## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

ئەم پەڕتوکە – پەروەردەی ئیسلامی بۆ پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی – هەنگاوێکی دیکەی پلانی گۆڕانکاری و گەشەپێدانی پرۆگرامی پەروەردەی ئیسلامییە، کە وەزارەتی پەروەردە بڕیاری لە سەر داوە و ئەرکەکەی سپاردو بە لیژنەیەکی تایبەت کە بۆ ئەم ئامانجەی پێك هێناوە.

لەئامادەکردنی ئەم پەڕتوکەدا رەچاوی کارێکی گرنگ کراوە، ئەویش گۆڕینی شێوازی نمایشی بابەتەکانە کە جیاوازە لەگەڵ پرۆگرامی پێشودا بە بەراورد، سەرەڕای بواری پەرستن لە ئایندا هەوڵمانداوە بایەخ بە چەند لایەنێکی دیکە گرنگی بدەین، وەك لێکدانەوەی ژیاننامەی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و زانایانی خزمەتگوزار بە کاروانی بانگەوازی ئیسلامی. ئامانجیشمان رۆشەنبیرترکردن و پترناساندنی نەوەکانمانە بە ئاینەکەیان و پەروەردەکردنیان بە شێوەیەکی دروستی ئەوتۆ بتوانن رۆڵی بەرچاو لە بنیاتنانی ئایندەی نیشتمانەکەماندا بگێڕن. هەروەك لە دەستپێکی پەڕتوکەکانی پۆلەکانی پێشو ئاماژەمان پێکردبوو. ئەرکی لیژنەکەمان لێرەدا کۆتایی پێدێت و ئەوا ئەرکە کە دەچێتە ئەستۆی هاورێیانمان لە پەروەردەکاران، کە بەرپرسن لە گەیاندنی ئەم پەیامە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە رۆلەکانمان، لەم رێیەشدا ئەگەری هەڵەو و کەلێن هەیە، بۆیە خوازیارین ئاگادارمان بکەنەوە لێی بە هیوای لادانیان لە چاپەکانی داهاتودا. لە کۆتاییدا داوا لە خودای باڵا دەست دەکەین کۆمەکمان بکات بۆ سەرخستنی پرۆسەی پەروەردە لە کوردستاندا.

**لیژنەی ئامادەکار**

## وانەی یەکەم

## بانگەواز و بنەماکانی لە ئیسلامدا

سەرەتا مرۆڤایەتی یەکدەنگ بوون لەسەر یەکتاپەرستی و باوەڕو خوداناسی پاشان جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، بۆیە خودای گەورە پێغەمبەرانی نارد بۆ بانگهێشتکردنیان بۆ خوداناسی، هەر لەم روانگەیەوە دیارە کە یەکێك لە ئەرکەکانی پێغەمبەرایەتی بانگەواز بۆ لای خوداو ئەنجامدانی کاری چاکەییە، وا لێرەدا ئاماژەی پێدەکەین:

١- بانگەواز بۆ لای خودا: بریتییە لە بانگهێشتی خەڵك بۆ وەڵامدانەوەی خواستی پەروەردەگارو سەلماندنی بە رەفتارو گوفتار لە ناخی خۆیاندا.

٢- گەیاندن بەڕوونی: ئەمەش روونکردنەوەی پەیامی خودایە بۆ بەندەکان، چونکە پێغەمبەران لە گشت کەسێك بە تواناترن لە تێگەیشتنی مەبەستی ئەو پەیامە.

٣- ئومێد بەخشین و ترسان: دوو بنەمای سەرەکین بۆ چونە ناخی مرۆڤەوە، بەو مەرجەی هاوڕێك بن لەگەڵ پەیامی خودادا. دەروونی مرۆڤ رامکراوە لەسەر چاکە خوازی بۆ خۆ بەدورگرتنی لە زیان. پێغەمبەران لەسەریانە ئەو راستییە بەخەڵك بگەیەنن کەلەسەر هەرکارێکی پەسند پاداشت و کاری خراپیش سزا وەردەگرن.

٤- چاکسازی و پاککردنەوەی دەرونەکان: خودای پەروەردەگار بەهۆی پەیامەکەیەوە ئادەمیزاد لە تاریکیەوە دەربازدەکات بەرەو روناکی، ئەمەش بەدی نایەت لەرێی وەرگرتنی پەیڤ و راسپەردەکانی پەروەردەگارەوە نەبێت و کە ناخیان پاکدەکاتەوە و ئاشنایان دەکات بە بەدیهێنەریان.

## بانگەواز خوازی کردن بۆ ڕێی خودا چۆن دەبێت ؟

بانگهێشت کردن بۆ ڕێی خوداو ئاینەکەی لە نێو مرۆڤدا بەگشتی و نێو ئەو نەتەوانەی نووسراوی خودایان بۆ هاتووە(ئەهلی کیتاب) بەتایبەتی پێویستە بە دانایی و دادگەرانە و بێ زیادە ڕۆیی و ئامانجداربێت و گوتارێك لەگەڵ ژیری و دڵدا گونجاو لۆژیکانە بێت .نابێت دانوستان و گفتوکۆ لەگەڵیاندا بەئاقاری توند و ناچارکاریدا ببرێت .خودای گەورە دەفەرموێت: (( أدعُ الى سبيل ربّك بالحكمة والموعظة الحسنةِ وجادلْهمُ بالتَّى هى أحْسَنُ إنّ ربَّكَ هو أعلمُ بمن ضلَّ عن سبيله وهو أعلمُ بالمهتدين)) **(النحل ١٢٥)**. واتە: خودا فەرمانی بە پێغەمبەر(د.خ)کردوە دانایی بەکاربێنێت لە کاتی بانگەواز بۆ لای خوداو،ڕەوش و دۆخی ئەقڵی و دەرونی و کۆمەڵایەتی بانگکراوان ڕەچاو بکات. وشەی نەرم وئارام بێت بەرانبەریان تا لێی بێزار نەبن. لەوەش بگەن تەنها مەبەستی گەیاندنی هەق و ڕاستییە بە خەڵك نەك هیچ مەبەستێکی دیکە،هەروەها ئەوەی بۆ خۆی بەڕەوا دەبینێت بۆ ئەوانیش بەڕەوا بزانێت و بە جوانترین شێوە بیاندوێنێت و ڕاو بۆچوونیان بەهەند وەربگرێت ڕێزی کەسایەتی بەرامبەر بگرێت، پشت بەو بەڵگانە ببەستێت کەلای هەردوولایەن پشت ڕاستن، چ بەڵگە ئاینیەکان، یان ئەقڵیەکان کە لە دڵدا جێگیر دەبن. ئەو کاتە ئەو بەرپرس نابێت لە ئەنجام، چونکە ئەرکی خۆی ئەنجامداوە و کۆمەکیش تەنها بەدەست خودایەو هەرخۆی دەزانێت کێ شایستەی کۆمەك و هیدایەتە یان بە پێچەوانە، ((وهو أعلم بالمهتدين)).

### بانگەواز لە چیدا دەدرەوشێتەوە

بانگەواز لە هەردوو پایەکەی شایەتماندا بەرجەستە دەبێت و دەدرەوشێتەوە :

پایەی یەکەم – بڕواهێنان بە بوون و تاکو تەنهایی خودای میهرەبان، یەکتاپەرستی لە قورئانی پیرۆزدا بڵندترین پلەی خودا ناسینە کە مرۆڤ لە سەرشۆری و خۆ بە کەمزانی ڕزگار دەکات، لەواتای (أشهد أن لا اله الاّ الله) دا بەرجەستە بووە.

پایەی دووەم– بڕواهێنان بە پێغەمبەرایەتی موحەمەد(د.خ) واتا کەشی:

ئ– پێویستبوونی ڕاستاندنی ئەوەی کە موحەمەد پەیامبەری خوداو کۆتا نێردراویەتی.

ب– هەروەها پێویستبوونی پشتڕاستکردنەوەی ئەو هەواڵانەیە کە ئەو هێناویەتی.

پ– پاشان بە پێویست زانینی گوێڕایەڵی لەهەر گوفتارو کردارو بڕیارێکدا لە فەرمان و قەدەغەکردن. ئەم پەیامەش لە مەبەستی بەشی دووەمی شایەتومان دایە کە(أشهد أنّ محمداً رسول الله) بوو.

## ئاین بە زۆرەملێ (ناچارکردن) نابێت

خودا دەفەرموێت : (( لا اكراه فی الدين قد تبيّن الرشد من الغیّ )) (البقرة٢٥٦)

ئاینی ئیسلام چاو دەپۆشێت لە نەیارەکانی لە رووی بیروباوەڕو پەرستشەوەو ناچاریان ناکات بێنە ناو ئیسلامەوە، بەڵکو دوای پێڕاگەیاندنیان، بواری بیرکردنەوەو تێرامانیان بۆ دەرەخسێنێت و سەر پشکیان دەکات لە باوەڕهێناندا، چونکە بەڵگە خوداییەکان روون و ئاشکران وە ناکرێت ئاین بەزۆر بەسەر کەس بسەپێنین.

## گفتوگۆ:

- ئەو دوو پایە سەرەکیانەی شایەتمان کامانەن؟
- دەستەواژەی (ئیسلام کەس ناچار ناکات لە هەڵبژاردنی ئایندا، بەڵکو تاك سەربەستە) رونبکەوەو بە ئایەتێکی قورئانی پشت راستی بکەوە.

## ئەرکی پێغەمبەران لەبەر رۆشنایی واتای ئەم ئایەتانەی خوارەوە روون بکەوە:

خودا دەفەرموێت:

١- ((اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ...)) (البقرة ٢٥٧).

٢- ((كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ...)) (البقرة ٢١٣)

٣- ((يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ....)) (المائدة ٦٧).

وانەی سێیەم

## خودا پەرستی



### واتای پەرستن:

پەرستن، واتە: ملکەچی فەرمانەکانی خوداو بەجێهێنانیان، وەك ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژو زەکات و حەجی ماڵی خوداو نزاو خوێندنەوەی قورئان و چاکە لە گەل دایباب و بەخشین و ڕاستگۆیی و سپاردەو وتەی جوان.

دەکرێت بازنەی پەرستن فراوانتر سەیربکرێت و گشت کردەیەکی ڕۆژانەی موسوڵمان لەخۆبگرێت لە خۆراك و خەوو کارکردن بۆ بژێوی گەر بە ڕەوایی (حەلال)و لە سنوری شەرعی خودادا بوو. هەموو ئەمانە نیشانەی ئاتاجین بەخودای گەورەو تەنها ئەوە شایستەی مل بۆکەچکردنە، ئێستا دەپرسین: ئایا شیاوە بۆموسوڵمان مل بۆجگە لەخودا بۆ هیچی دی کەچ بکات؟

## خودا پەرستی سروشتییە (فطرة)یە

مرۆڤ بە فیترە و سروشتی نە گۆڕاوی خۆی خودا دەناسێت و دەشی پەرستی.

خودا دەفەرموێت(( فأقِمْ وجهَك للدين حنيفاً فِطرةَ اللهِ التي فَطَر الناسَ عليها)) (الروم ٣٠).

ئەم ئایەتە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە سروشتی ئاسایی روو لە پەروەردگار دەکات و پەرستن و فیترەیش هاورێکن، کوفرو سەرپێچیش دوانەی یاخیبوون و پشت لەفیترەتکردنن. ئەو هۆکارانەش دەبنە پاڵنەری پەرستنی جگە لە خودا. لە دەرەوەی سروشتی رەسەنەوەن و بە کاریگەری دەوروبەرو لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و خێزانییەوە سەرچاوە دەگرن.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت(( كلُّ مولود يُولدُ على الفطرة فأبواه يُهوِّدانه أو ينصرانه او يمجسانه)).

## خودا پەرستی خواست و پێویستییە

لە مرۆڤدا بە شێوەیەکی سروشتی و پاڵنەری پەنابردن هەیە بە خودای گەورە تا خواستەکانی بۆ بەدی بێنێت لە کاتێکدا دەستەوستان و لاوازە، ئەمەش وەك پەیوەندیەکی گیانی (روحی) لە نێوان خوداو بەندەکەیدا کە دەبێتە هۆی هەستکردن بە هێزێك دەیپارێزێت و سەری دەخات و رۆزی دەداتێ وچارە سەری بۆ دەنێرێت، کاتێك لەماڵ دەچێتە دەرێ و دەلێ( بە ناوی خوداو پشت بە خودا) بڕوای وایە زیانی پێناگات ، بەلام ئەو کەسەی ئەم پەیوەندیە گیانییەی نەبێت هەست بە و کۆمەکە ناکات.

## فەرمانی خودا پەرستی

ئەم فەرمانە هەر لە سەرەتاکانی بەدیهاتنی مرۆڤەوە بووە هیچ گەلێکیش بێ پەیامبەر نەبوون و بانگی خودایی بەهەمووان گەیوە، بە پێی ئەم ئایەتە (( ولقد بعثنا في كل أمـةٍ رسـولاً أن أعبـدوا الله واجتنبوا الطاغوت )) (النحل ٣٦).

خودا پەرستی مافی خودایە بەسەر بەندەکانیەوە، سەیرو نامۆیە گەر ئەم مافە نەسەلمێنرێت پێغەمبەرمان(د.خ) لەم رووە دەفەرموێت: ((مافی خودایە بەسەر بەندەکانیەوە پەرستشیەتی و نابێت هیچ هاوبەشیەکی بۆ دابنێن)). جا ئەگەر پرسیارکرا: بۆچی خودا پەرستن ئەرکە و پێویستە لەسەر ئادەمیزاد؟ وەڵامەکەی : چونکە خودا پەرستی مافی خودایە بەسەر دروستکراوانیەوە- هەرئەو بەدیهێنەرو رۆزی دەرو کۆمەککارو چارە بەخش و فریادڕەسیان.

## پەرستن کردەوەیە

بڕوادار بەکەسێك دەوترێت باوەڕ لە دڵیدا جێگیربووبێت، ئەم باوەڕە بە کردەوە دەسەلمێت و پشتراست دەکرێتەوە، واتە چوونە قۆناغی کردەیی و لێرەشدا بەرهەمی باوەڕ چرۆدەکات بۆیە وەك لە (حەسەنی بەسری)گێڕدراوتەوە ((باوەڕ بەئاوات خواستن بەدی نایەت، بەڵکو ئەوەیە لە دڵ بچەسپێت و بەکردار بسەلمێنرێت)).

کەواتە باوەڕ هاورێی کردەوەی باشە و بەو کردەوانەیە مرۆڤ دەبێتە هەڵگری نازناوی (باوەڕداری خوداپەرستی راستەقینە).



وانەی چوارەم

## جۆرەکانی خودا پەرستی

پەرستش چوار جۆرە:

١- **پەرستشی نێودڵ:** ئەوەیە کە تاکی باوەڕدار لەدڵیدا بڕوای وابێت خۆشویستن و قین و ترس و ئومێدی هەر لەبەر خوداو بەخودا بێت.

٢- **پەرستشی جەستەیی (بەدەنی):** ئەنجامدانی نوێژ ، ڕۆژو گرتن، حەجی ماڵی خودایە گەر توانا هەبوو.

٣- **پەرستشی زار(وتە):** بە یادکردنەوەی خوداو لێپاڕانەوەو خوێندنی قورئان دەبێت.

٤- **پەرستش بە سامان:** بە زەکاتدان و سامان بەخشین بە هەژاران دەبێت.

### کاریگەری شوێنەواری خودا پەرستی

١- لەسەر روخساری مرۆڤی باوەڕدار:

لە روخساری مرۆڤی خاوەن باوەڕی خوداپەرستدا شێوازێکی باوەڕداری درەوشاوە بەدی دەکرێت، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (( سيماهم في وجوههم من أثر السجود))(الفتح٢٩). واتە: روخساریان ئاکاری باوەڕداری پێوە دیارە.

٢- لەسەر ئاکارو رەوشتی:

هەستی پێدەکرێت لە ئارامگرتن و لێخۆشبون و راستگۆیی وپاراستنی سپاردەو سۆزو دڵپاکییدا.

دڵی مرۆڤی وا لای خودا بەسۆز و بەزەیی و دامەزراو و ئارام و جێگیر وەسفکراوە: (( ألا بذكر الله تطمئن القلوب))(**الرعد٢٨**).

٣- لەسەر خێزان و کۆمەڵگە: یارمەتی دەرە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی ئارام و تەبا، برایەتی و ئاسوودەیی و هاوکاری باڵی بەسەردا دەگرێت.

وانەی پێنجەم

## وەرگرتنی پەرستش لەلای خوداو ، مەرجەکانی



وەرگرتنی پەرستش بە سێ مەرج دەبێت لای خودا:

**١- پەرستکار خاوەن باوەڕبێت:**

کاتێك پەرستشی مرۆڤ جێدەگرێت و خودا وەریدەگرێت ئەم مەرجانەنەی تێدابێت: بڕوا بەخودا، فریشتەکانی، گشت پەیامەکانی و هەموو پێغەمبەرانی و رۆژی دوایی و چارەنووس بە خۆش و ناخۆشیەوە ، بە پێی ئەم ئایەتە: ((من عمل صالحا من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فلنحيينه حياة طيبة)) **(النحل٩٧)**.

**٢- پەرستش تەنها بۆ خودابێت:**

واتە باوەڕدار تەنها مەبەستی خوداو رەزامەندی بێت دوور لە هاوبەشکاری وبەرژەوەندی و چاوەڕێی سودی دونیایی، بە پێی ئەم ئایەتە: ((فَمَنْ كان يرجوا لقاءَ رَبِّه فَليعملْ عملاً صالحاً ولايُشْرِك بعبادة ربِّه احداً)) **(الكهف ١١٠)**.

**٣- پەرستشەکە بە پێی سوننەت بێت واتە بێ زیاد کردن و کورتهێنان.**

### پاداشتی خودا پەرستی

خودای کارساز بەڵێنی بە باوەڕدارانی خوداپەرستی پیاوو ژن داوە کە:

١- پەرستشەکانیان لێوەربگرێت و بۆیان پاشەکەوت بکات وەك دەفەرموێت: (( فاستجاب لهم ربُّهم انى لاأُضِيعُ عملَ عاملٍ منكم)) (آل عمران ١٩٥).

١- ٢- چوونە بەهەشت: خودا دەفەرموێت: (( والذين آمنوا وعملوا الصالحات سندخلهم جناتٍ تجـرى من تحتها الانهار خالدين فيها أبداً )) (النساء ٥٧) .

## راهێنان(١)

١- بە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بیسەلمێنە، ئیسلام ئاینی فیترەتە.

٢- ئایەتێك بێنە فەرمانی بە پەرستنی خودای تێدا بێت.

٣- بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بیسەلمێنە، باوەڕ بە ئەنجامدانی کردەوەی چاك دەچەسپێت.

٤- فەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) بێنەرەوە، پشتگیری لەوە بکات پەرستنی خودا مافی خۆیەتی لەسەر بەندەکانی.

## راهێنان(٢)

١- کە دەڵێین: (خودا پەرستی خواست و پێویستییە) ئەم دەستەواژەیە روونبکەوە.

٢- ئەم برگەیە چی دەگەیەنێت (خوداپەرستی کاریگەری لەسەر جەستەی مرۆڤ جێدەهێڵی ).

٣- مەرجەکانی وەرگرتنی پەرستش لای خودا، چین؟

٤- خودای پەروەردەگار بەڵێنی پاداشتی گەورەو باشی بەباوەڕدارانی خوداناس داوە.
ئەم دەستەواژەیە راڤە بکە.

## راهێنان(٣)

ستونی یەکەم بە ستونی دووەم بگەیەنە بەپێی گونجان:

| | |
|---|---|
| ١- خوێندنەوەی قورئان پەرستشێکی | جەستەییە |
| ٢- حەجکردن پەرستشێکی | سامانیە |
| ٣- زەکاتدان پەرستشێکی | نێودڵە |
| ٤- خۆشویستنی خودا پەرستشێکی | زارییە |

## راهێنانی(٤)

وەڵامی راست لە نێو کەوانەکاندا بۆ ئەم بۆشایانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١- سەیر لەوەدانییە خودای گەورە مافی پەرستنی بەسەر بەندەکانەوە هەیە،بەڵام سەیرو نامۆ ئەوەیە............(ئەم مافە پێشێل بکرێت-جێبەجێکرێت-مافەکە بەهێزبکرێت).

٢- هەرکەسێك پەیوەندی گیانی بەخوداوە نەبێت..........(دڵەراوکێی نابێت - کۆمەك و پارێزگاری نابێت).

## چالاكی:

**مامۆستا داوا دەكات كە قوتابییان ئەم دیمەنە نمایش بكەن:**

**گفتوگۆیەك سەبارەت(پەرستش)لەنێوان شاهۆ و سەرداردا.**

**- شاهۆ بە سەردار دەڵێت: من وا دەزانم پەرستش تەنها نوێژو رۆژ و ناگرێتەوە.**

**- سەردار: ئەی چیتر دەگرێتەوە؟**

**- شاهۆ: بۆم روون بۆتەوە كە پەرستش لەكار و ئەركی رۆژانەشدا دەكرێ هەبێت.**

**وەك:وەرزش و خواردن و نوستن.**

**- سەردار: ئەم زانیاریانەت چۆن دەستكەوت؟**

**-شاهۆ: لەرێی وتاری هەینی ،مزگەوتەكەی نزیك ماڵمانەوە.**

**- سەردار:كەواتە، بەردەوام دەبین لەسەر نوێژو رۆژوەكانمان وژیانی رۆژانەشمان بەشێوەیەكی دروست و ئاسایی بەسەر دەبەین،هەمووشی پەرستشە.**



وانەی شەشەم

## مافی خزمایەتی و گەیاندنی



ئەم پەیوندی و مافە لەسەر یەکتری لەنێوان کەس و کاردا،لەو ئەرکە پیرۆزانەیە کە لەئاینی ئیسلامدا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و تاکەکان پێکەوە دەبەستێتەوە،هاورێکیشە لەگەڵ فیترەتی پوخت و،شەریعەتی پیرۆزیش دانی پێداناوە.بۆیە پێغەمبەری خودا(د.خ) خزم وکەس وکاری هانداوە هەمیشە ئەو پەیوەندیانە توندو تۆڵ رابگرن لە نێوانیاندا. کوڕی مەسعود(خ.ر) دەڵێت: ((پێغەمبەری (د.خ) فەرمویەتی لەخودابترسن و خزمایەتی توندوتۆڵ رابگرن)).(کوڕی عساکر وبەیهەقی ریوایەتیان کردووە).

**راگرتن و پەیوەندی نێوان خزمان واتە :چاکەکردن لەگەڵیان بەم رێیانەی خوارەوە :**

١-خۆماندووکردن لەپێناویەکتردا.

٢- سوود گەیاندنی جەستەیی.

٣- سوودی دارایی وسامان پێدان بەپێی پلەی کەسایەتی و پێویستی.

گەر ئەم خاڵانەش بەئاسان بەدەستەوە نەهات، ئەوا بە ئاکاری جوان دەکرێت لە:

ئ-وشەی جوان.

ب-ڕووی خۆش و کراوەیی.

پ-نەرم و نیانی.

ت-باڵی میهرەبانی ڕاخستن و،هەر ئاکارێکی دیکە خۆشەویستی زیادبکات.

پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێت :((پەیوەندی کەس و کار زیندو ڕابگرن بابە سڵاو کردنیش بێت)).فەرمودەکە پلەی (باشە)ی هەیە.

کەسانێك هەن مامەڵە بەهاوتایی دەکەن لەگەڵ بەرامبەردا،ئەمەش لەئیسلامدا پێی ناوترێت (صلةالرحم)بەڵکو ئەوە چاکە بە چاکەیە و لەنێوان گشت کەسدا پیادە دەکرێت،بەڵام گەیاندن و ڕاگرتنی خزمایەتی پێویستە بێ چاوەڕێی بەرانبەر بێت ومەبەست ڕەزامەندی خودابێت وبەس.

باوکی هوریرە لەپێغەمبەرەوە (د.خ) دەیگێڕێتەوە کە خودا فەرمویەتی: ((منم ڕەحمان ،پەیوەستی خزمایەتیم بەدیهێناوە و لەناوی خۆم پێکم هێناوە، هەرکەس گەیاندی منیش پەیوندیم لەگەڵی دەبێت و ئەوەش دایبڕێت لەگەڵی دادەبڕێم هەرکەسیش بەردەوام بوو لە چەسپاندنی،منیش چەسپاوی دەکەم،سۆزو بەزەیی من پێش ڕق و قینم کەوتوە)).ئەحمەد وبوخاری و باوکی داود و ترمزی و بەیهەقی و حاکم،هەموو ریوایەتیان کردووە.

لەم فەرمودەیەدا(پەیوەندی خزمایەتی)وهاموشۆ و سۆز لەگەڵ خزمان و سەردانیان بەهەند و گرنگ وەرگیراوە، دووجۆر پەیوەندیش هەیە:

١- گشتی:واتەپەیوەندیی ئایین کە پێویستە بەردەوام بێت و بەچاکەی دوولایەنە و ئامۆژگاری و دادوەری ومافپارێزی و ویژدان بەکارهێنان،بپارێزێت.

٢- تایبەت: بەسەرفکردنی سامان بۆخزم و هەواڵ پرسی و لێبوردەیی لەهەڵەکانیان دەبێت.

**چاکەی سۆز و بەزەیی ( سیلەی ڕەحم ) و بەرهەمەکانی :**

١- گەیاندنی سۆز و بەزەیی، پەرستنی خودایە(جل جلاله).

٢- گەیاندنی ڕەحم دروشمی باوەڕبەخوداو ڕۆژی دواییە.

٣- دەبێە هۆی گەیاندنی سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و میهرەبانی بەکەسانی گەیەنەر و سەردانیان کاریان بۆ ئاسان دەبێت و لەتەنگژە ڕزگار دەبن.

٤- ڕەزامەندی و سۆزی خودا بۆ بەندەکانی خودا دەستەبەر دەکات.

٥- پاداشتی گەیاندنی سۆز و بەزەیی (پەیوەندی خزمایەتی) زۆر بە پەلە دەدرێتەوە.

٦- هەڵە وناتەواوی بەندەکانی لای خودا پێ دەسڕێتەوە.

٧- دەبێتە هۆی بەرەکەت (پیت و فەڕ) لە ڕۆزی و تەمەندا.

٨- ئاوەدانی لێدەکەوێتەوە.

٩-هۆکارێکی گەورەیە بۆ گەیشتن بە بەهەشت.

## وانەی حەوتەم

## ڕێ و شوێنی سەردان و باروبۆکردن و دەستگرتن



پێویستە چەند ئاداب و ئاکارێکی پەیوەست بە گەیاندنی سۆز و خۆشەویستی فێرببین ،لەوانەش:

**ئاکــاری یەکــەم-** مەبەسـت و نیـاز پـاك و،دڵسـۆزی،خودای پـەروەردگار تـەنها کـارە پوختـەکان وەردەگرێت،بۆیە پێویستە مرۆڤ پابەند بێت بەپوخت و پاکی لەپەیوەندیی خزمایەتیداو نیازی ئەم کارەی لەبەرخودابێت، نەك بۆ روپایی و ناوبانگ و خۆپیشاندان.

**ئاکاری دووەم-** لە نزیکترین کەسیەوە دەست پێ بکات:

واتە پەیوەندی خزمایەتی بۆ کەسە هەرەنزیکەکان پێویستترە،وەك دایك و باوك و... هتد.

پێغەمبـــەر(د.خ) لـــەوەڵامی پرســـیارێکدا ســـەبارەت: شایســـتەترین کـــەس بۆ پەیوەنـــدی خزمایەتی،فەرموی: ((دایکت، پاشان دایکت، پاشان هەر دایکت، ئینجا باوکت و پاش ئەویش کێ نزیکترە)).

**ئاکاری سێیەم-** هەروەها گەیاندنی رەحم بۆ کەس وکاری بێ بڕواش دروستە بـۆ خزمـی موسـوڵمانی سسـت وکەمتەرخـەمیش بـەرێبازی ئامۆژگـاری وبانگهێشـت کردنـی بـۆ کـرداری چـاك و پابەنـدی بەئاینەوە،بـەوەش هـەر دەووترێـت (سیلەی رەحم).

ئاکاری چوارەم- شادکردنی خزمان:

بەهەر شێوازێك بگونجێت،وەك:سەردان و بەسەرکردنەوەیان بەتایبەت لەبۆنەکاندا وەك جەژن ولەدایکبون وئاهەنگی هاوسەرگیری.هەروەها لەرێی تەلەفۆن ونامە بۆ ناردن ودیاری ناردن،هەواڵ پرسین و سەردانی نەخۆش و لێدانەبڕانیان ئەم ئاکارانە بناغەن بۆ خۆشەویستی و پەیوەندی توندوتۆڵ.بەم شێوەیەش دەتوانین دڵی یەکدی خۆش و شاد بکەین.

## گفتوگۆ

١- وەڵامی راست لەنێوان کەوانەکاندا هەڵبژێرە:

١- ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی دەپارێزێت، ئەوەیە: ( لەو کەسە دادەبرێت کە هاتوچۆی نەکات – پاداشت لەسەر چاکە دەدات- تەنها لەبەر خودا خزمایەتی رادەگرێت)

٢- لە ئاکارەکانی سیلەی رەحم ئەوەیە، کەس و لایەنی راگری پەیوەندی خزمایەتی چاوەرێی (کرێ- پاداشت- پاداشتی خودا) لە بەرانبەر بکات.

٣- راگرتنی پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان کەس و کاردا( خۆشەویستی و رێز – قین و رقبونەوە- دوری لە یەکترگرتن) دەچێنێت.

٢- کەسایەتی (خزمایەتی) ئەو ناوانەی خوارەوە پلە بەندی بکە:

١- ئامۆزا  ٢- باوك  ٣- برا  ٤- دایك

٣- دووبوار(شێوان)ەکەی گەیاندنی رەحم، کامانەن ؟ بیان نوسە.

٤- ئەم فەرموودانەی خوارەوە، ئاماژە بەکام بەرهەم و رێزداری شایستە بە گەیاندنی رەحم، دەکەن:

١- فەرمودەی:(( لا یدخل الجنة قاطع الرحم)).

٢- فەرمودەی: (( من أحب أن یبسط له في رزقه وینشأ له في أثره، فلیصل رحمه)).

٣- فەرمودەی: (( صلة الرحم وحسن الخلق وحسن الجوار یعمرن الدیار ویزدن في الاعمار )).

٤- فەرموودەی: ((**قال الله تعالی حقّتْ صحبتي للمتواصلین فيَّ**)) (صحیح رواە أحمد).

## ڕەوشت و بەها باڵاکانی موسوڵمان



مرۆڤی باوەڕدار خاوەنی ڕەوشتی بەرزە کە خودای گەورە فەرمانی پێدەکات و پێغەمبەرمان(د.خ) جەختی لەسەر دەکاتەوە بە فەرمودەی: ((انما بعثت لأتممّ مكارم الاخلاق)).

بەرەوشتی بەرز کەسێتی مرۆڤی باوەڕدار مەزن دەبێت و ئاکاری خاوێن هاوتەریبی باوەڕی پتەوە لە ژیانی مرۆڤی موسوڵماندا. تا باوەریش بەرزو دروست بێت پێگەی خاوەنەکەشی بڵند دەبێت.

ئەی قوتابی خۆشەویست، ئەگەر پابەندی بەها باڵاکانی وەك پوختی و لێبوردەیی و ئارامگرتن و شەرم و هاوکاری و وەفا دەبێت، ئەوا هەنگاو بەرەو چەند ڕەوشتێکی گرنگ بنێت لەوانەش:

**١- داوێن پاکی:** کە بریتییە لە خۆپارێزی لە گشت حەرامێك بە تایبەتی داوێن پارێزی لە بەد ڕەوشتی و کاری ئابڕووبەر.

خودای گەورە فەرمانی کردووە بە موسوڵمانان داوێنیان بپارێزن وخۆڕاگربن لە بەرشاڵاوی ئارەزووبازیدا و خۆ لەسەرەتاکانی بپارێزن.

چونکە مرۆڤ بەرەو هەڵدێر دەبات و دواتر ناتوانێت بەسەر ئارەزووەکانی زاڵ بێت. لە قورئانی پیرۆزدا بە چەندین ئایەت ڕێگری کراوە لەو کردەوە ناشیرینە.

خودای گەورە دەفەرموێت: (( ولا تقربوا الزنى انه كان فاحشةً وساء سبيلاً)) (الاسراء٣٢).

ناکرێت مرۆڤی باوەڕدار بەدوای کاری بێزراوی وادا بگەڕێت بەڵکو داوێن پیسی و باوەڕ لەیەك کاتدا کۆنابنەوە لە کەسێکدا وەك پێغەمبەرمان(د.خ) دەفەرموێت: ((لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن)).

مرۆڤی موسوڵمان زۆر لەوە بەرزو بەڕێزترە کە سێیتی خۆی دابەزێنێت بۆ ئەو ئاستە نزمە، کە شایستەی ئەو نییە، بە ئەنجامدانی کاری داوێن پیسی موسوڵمان پێویستە بە وشیارییەوە هەنگاو بنێت و ئەقل بەکاربێنێت، کە ڕێنمایی دەکات بۆ بەهای (داوێن پاکی).

بەرهەمی بەهای داوێن پاکی:

١- پاراستنی ناموس.

٢- ناوبانگی باش و بڵند.

٣- متمانەی نێو خەڵك.

٤- کەسێتی هاوسەنگ.

٥- پاراستنی تەندروستی جەستەیی.

**٢- سپاردە:** بە واتایی خۆ دوور گرتن لە فێڵ و دزی و ناپاکی و پاراستنی سپاردەی قسەو سامان و هەر نهێنیەك.

جۆرەکانی سپاردە:

ئ- جۆرێکیان سپاردەی ئەو قسانەیە کە لای کەسێکی دیکە دەکرێن و قسەکەر ئەم لاو ئەولا دەکات بە مەبەستی ئەوەی کەسێکی دیکە ئاگادارنەبێت، یان کە بەبەرامبەر بڵێت ئەمە قسەی نێوانمان بێت، ئەمەش دەبێتە سپاردەیەکی گران و ئەرکێکی پێویست. پێغەمبەر دەفەرموێت (د.خ): ((اذا حدّث الرجل الحديث ثم التفت ، فهي أمانة)).

ب- جۆرێکی دیکەی سپاردە، بابەتی دارایی و سامانە، کە دەدرێتە دەست کەسێکی دیکە و دەچێتە ئەستۆی و پێویستە بە دەستپاکی و بێ دەستکاری بیداتەوە دەست خاوەنەکەی.

باشترین پێشەنگی مێژویی بە پشتگیری قورئان لە سپاردە پارێزیدا یوسف پێغەمبەرە (د.خ) وەك قورئان دەفەرموێت: ((قال اجْعَلْني على خزائنِ الارض إنّ حفيظٌ عليم)) **(یوسف ٥٥)**.

پ- هەندێك جار سپاردە لە مامەڵە و فرۆشدایە واتە فێل نەکردن لە ئالێ و وێل و جۆری کالادا کە پێویستە بەپێی پێوەرە شەرعیەکان بێت.

پێغەمبەرمان (د.خ) بەلای خۆراکفرۆشێکدا تێپەڕی بینی خۆراکەکەی ئاوی زیادەی تێدایە لێی پرسی هۆکارەکەی چییە، گوتی: باران تەڕی کردووە، سەروەر فەرمووی: تەڕبووەکەت لە سەرەوە دانایە تا خەڵکی بیبینن، جا فەرمووی: ((من غشّ فليس منيّ)).

ئەمە ئامۆژگاریە بۆ گشت فرۆشیارێك کە کالاکەی بە درۆو فێڵ ساغ نەکاتەوە.

سیماو بەرهەمەکانی بەهای سپاردە پارێزی:

یەکەم- ناوبانگی باش.

دووەم- متمانەی نێوخەڵکی.

سێیەم- دڵسۆزی و پوختی لە کاردا.

## وانەی نۆیەم

## ڕەوشت بەرزی ( الحیاء )



ڕەوشتێکی بەرزو چاکە کارە لە بەرامبەر کۆمەڵگاو کەسانی دیکە بۆ بەجێهێنانی مافی خاوەن مافدا، ڕەوشتێکە دەبێتە هۆی وازهێنان لە کاری ناپەسندو کەمتەرخەمی نەکردن لە بەجێهێنانی مافی خاوەن مافدا.

ڕەوشت بەرزی – واتا (الحیاء) بریتیە لەو خەسلەت و ڕەفتارە پەسەندو جوان و بەهادارانە کە لە بەرامبەر کەسانی دیکە دەکرێت و سەرنجیان بۆ ئەو کارانە رادەکێشێت هەمان ڕەفتارو ڕەوشت بەرزی بنوێنن. لەم فەرمودەیەدا ئەم راستیە دەردەکەوێت پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: ((ما كان الفحش في شيء قطّ الاّ شانه، وما كان الحياء في شيء قطّ الا زانه)). پێغەمبەری مەزن(د.خ) بۆ خۆی باشترین سیمای ڕەوشت بەرزی هەبوە و بە لقێکی باوەڕی هەژمارکردوە.

### جۆرەکانی ڕەوشت بەرزی

**ئـ- ڕەوشت بەرزی لە خودا :** بڵندترین پلەی ڕەوشت بەرزیە. تۆی قوتابی گەشە دەکەیت و بەخششەکانی خودای میهرەبان لە جەستەی خۆت و ڕۆزی و ئاوهەوای زەوی دایك، کە لەژمارە نایەن روونتر هەست پێ دەکەیت. ئایا خاوەنی ئەم نیعمەتانە شایستەی سوپاس گوزاری نییە؟
بێگومان بەڵێ. کاتێك باوەڕ لەدڵتا چرۆدەکات وگەشەدەکات، ناخوازیت سەرپێچی پەروەردگارت بکەیت و بە چاودێری نەزانی و یادی نەکەیت. چونکە وەلامی چاکە هەرچاکەیە. جا کەسێك هەیە لە خودا زیاتر چاکەی لەگەڵ تۆ کردبێت؟ ئایا دەکرێت وەڵامی چاکە بە خراپە بدەیتەوە؟ ئەوە کاری تۆو کەسی دیکە نییە دژی فیترەت و سروشتی پاك بجوڵێتەوە.

### ب- ڕەوشت بەرزی لە بەرامبەر دایك و باوك:

لە نیشانەکانی پەروەردەی دروست ڕێزگرتنە لە باوك و دایك، هەروەها گوێرایەڵیان، هاوکاریکردنیان، چاودێری کردنیان لە ناساغیاندا، بە ئارامی و هێواشی و نەرم و نیانی دواندنیان، خۆ دورگرتن لە توندوتیژی بەرانبەریان، ئەمانە هەموی دەرەنجامی ڕەوشت بەرزین، چونکە ئەوان بە سۆزبوون لە گەڵت شەویان بەبێداری بەسەر بردووە، لە کاتی نەخۆشیتا لە ئامێزیان گرتووی، تێریان کردووی، کەواتە کارێکی نا دروستە وەلأمیان بەئاکاری جوانتر نەدەیتەوە.

### پ- ڕەوشت بەرزی لە بەرامبەر پەروەردەکاران و مامۆستایان:

دەبێت مرۆڤ ڕەوشت بەرزو ئارام بێت بەرانبەر مامۆستا چونکە پەروەردەو زانیاری پێدەبەخشن ئایندەی بۆ مسۆگەردەکەن، مرۆڤ بە رووی گەشەوە، بە دەنگی هێواشەوە بە دەریایەك لە ڕەوشتی بەرزەوە، گوێڕایەڵی داواکانیان بێت، لە تاقیکردنەوەدا سەر ڕاست بێت، ئامۆژگاریان لێوەربگرێت، دەستێکی هاوکار بێت بۆ مامۆستاکەی لەهەر کارێکدا بەرژەوەندی قوتابخانەی تێدایە.

### ت- ڕەوشت بەرزی لە گوفتاردا:

لە دووبواردایە:

**یەکەم-وتە (وشە):**

تا دەتوانیت وشەکانت کورت و پڕمانا بن و بە پێی پێویست بن، چونکە هەر وشەیەك لێپرسینەوەی لەسەرە، هەروەها مافی گوێگران ڕەچاوبکە و زۆرمەڵێ، بێزاریان مەکە، زۆربڵێی تەنگژەی بە دواوەیە.

هەروەها گاڵتەکردن کەمکەوە، چونکە کەسایەتی مرۆڤ ناهێڵێت و خۆت لە وتەی بێ بنەماو مەبەست بپارێزە، جنێو بەکەس مەدە، بەم شێوەیە ناحەزت نابیت و توشی کێشە نابیت.

**دووەم-دەنگ:**

با دەنگت بەئەندازەی پێویست بێت، هەستی گوێگر بریندار مەکە. خودای گەورە دەفەرموێت:

((واغضضْ من صوتك إنّ أنكر الاصواتِ لَصوتُ الحمير)). (لقمان١٩)

### ه- ڕەوشت بەرزی لە پۆشیندا:

ئاینی ئیسلام سنورو ئەندازەی پۆشاکی شایستەی بۆ پیاو و ژنی موسوڵمان دیاریکردووە، بۆ پیاوان داپۆشینی نێوان ناوك و ئەژنۆ. بۆ ژنان جگە لە دەست و روخساریدا بپۆشێت، ئەمە سنوری خودایە فەرمانی خودایە، سەرپێچی لێکردنی بەزاندنی ئەو سنورەیە.

## راهێنانی(١)

١- فەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) بێنەوە موسوڵمانان ئاگاداربکاتەوە کە باوەڕو کاری داوێن پیسی پێکەوەو لەیەك کاتدا کۆنابنەوە.

٢- فەرمودەیەکی دیکە بڵێ داوای سپاردە پارێزی لە قسەی نهێنی بکات.

## راهێنانی (٢)

١- سیماکانی بەهای داوێن پاکی چین(کامانەن)؟

٢- بەهای سپاردە پارێزی چییە؟

## راهێنانی (٣)

وەڵامی راست لە نێوان کەوانەکاندا بۆ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١- موسوڵمانی داوێن پاك جیادەکرێتەوە بە ................(میوانداریکردن- ناوبانگی باش- زیرەکی )

٢- رەوشت بەرزی خاوەنەکەی ...............(دەرازێنێتەوە- لە کەداردەکات- دەروخێنێت)

٣- گەر بەسپاردە ماڵێك درایە دەست یەکێك..........(دروستە دەستی بەسەر دابگرێت- پێویستە بیپارێزێت- دەتوانێت خەرجی بکات)

٤- گەر موسوڵمان لە پەتای بەدرەوشتی دوور بێت ئەوا............(لەکاریگەریی پارێزراوە- پتر ئارەزووی دەکات- ژیریی کەم دەکاتەوە)

دەروونم رادەهێنم لەسەر ئەم راستیانە:

١- کاتێك دەڕوانمە بەخششە لە ژمارە نەهاتوەکانی دەوروبەرم، لە زەوی رازاوەو تاڤگە رەنگینەکان ...هتد، بەخشندەیی خودای میهرەبانم بۆ دەردەکەوێت و دەیپەرستمو خۆم دوور دەگرم لەسەرپێچیکردن.

٢- کەبیردەکەمەوە لە ئەرك و ماندووبوونی باوك و دایکم، شەونخونیان و پلانیان بۆ دابینکردنی ئایندەیەکی گەش بۆم، لە سۆزو میهریان تێدەگەمو هەرگیز بێ رێزیان بەرامبەر ناکەم.

٣- پەروەردەکاران و مامۆستایانم، هەردەم زانستم فێردەکەن و سوودم پێدەگەیەنن و پەروەردەی دروستم دەکەن، بۆیە نا دروستە ئەگەر رێزیان نەگرم.

٤- کە دەڕوانمە بێزاربوونی دەوروبەر، لە دەنگی بەرزو هاوارکردن، تێدەگەم ئەوە کارێکی ناپەسندە، بە هێواشی دەیاندوێنمو کارێکی بێزارکەر ناکەم بەرامبەریان.

## بەر پەرچدانەوەی خراپەکاری بە چاکەکردن



پێویستە رۆڵی مرۆڤی موسوڵمان لە کۆمەڵگەدا دیارو لە بەر چاوبێت، ئەو وەك پزیشکێکە چارەسەری نەخۆشی دەکات، یان وەك مامۆستایەك قوتابییانی پەروەردە دەکات، لە بەر رۆشنایی و لەسەر رێبازو رێنیشاندانی پەیامی دروستی ئیسلامدایە، بە ئاوەزێکی هۆشیارانەو هەستێکی پاکەوە ئاکار دەنوێنێت، هەڵە بە هەڵە و خراپە وەلام ناداتەوە، تاریکی بە رۆشنایی دەرەوێنێتەوە، رەفتاری نەفامان و دەمارگیران بەلاوە دەنێت و بە چاکە وەڵامیان دەداتەوە وەك لە قورئاندا خوای گەورە فەرمویەتی: ((وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا)) (الفرقان ٦٣).

پێویستە تاکی موسوڵمان بە رەفتارو گوفتار بیسەلمێنێت، کەسێکی پشوو درێژو بەئارامەو دەتوانێت لەگەڵ چاك و بەد لە موسڵمان و کەسانی تریش بەنەرمی بجوڵێتەوەو ئاوێنەی ئیسلام بێت.

## چەند رووداوو چیرۆکێك سەبارەت بە بەرپەرچی خراپەكاری بە چاكەكردن

ئ- براكانی یوسف پێغەمبەر (د.خ) بە پلانێكی بەد یوسفیان فرێدایە چاڵێكەوە، بەمەبەستی لەناوبردنی بەلام نەخشەی خودای گەورە جۆرێكی تربوو، هۆكاری رزگاربوونی بۆناردوو دواجار پلەی وەزیری لە میسردا وەرگرت و، دوای چەندین سال براكانی رێیان كەوتە ئەویَ و كاتێك یەكتریان ناسیەوەو، دانیان بەهەلە كانیاندانا، یوسف لێیان خۆشبوو دوعای بۆكردن. لەقورئاندا.

بەم شێوەیە باسكراوە : ((قالوا تالله لقد آثَرك اللهُ علينا وإنْ كنّا لخاطِئين. قال لاتثريبَ عليكم اليوم يغفر اللهُ لكم وهو ارحم الراحمين)) **(یوسف٩١-٩٢)**.

ئەمەیە لێبوردەیی جوان لە مرۆڤی باوەڕدارەوە بەرانبەر تاوانێكی گەورە.

ب- ئادەم(د.خ) دوو كوڕی هەبوو(قابیل و هابیل) لە ئەنجامی كێشەیەكی نێوانیان، قابیل ویستی هابیل بكوژێت، بەلام هابیل بەرانبەری نەوەستایەوەو هەڵوێستی توندی وەرنەگرت، وەك لە قورئاندا هاتووە ((لَئن بَسَطْتَ الىّ يدَك لِتَقْتُلنى ما أنا بباسطٍ يدىَ إليك لأَقْتُلكَ)) **(المائدة٢٨)**.

ئەمەیە ئارامگرتن و وەلامی جوان بەرانبەر ویستی نارەوای برایەكی دڵرەق.

پ- ئەبولەهەب مامی پێغەمبەر پاشە رۆی ماڵەكەی فرێدەدایە بەر ماڵ و رێی موحەممەدی (د.خ) برازای، ئەویش بە نهێنیی دەیفەرموو ئەی كوڕی عەبدول مەناف دراوسێیەتی كەی وادەبێت؟

بەم هەڵوێستە شیرینە وەڵامی رەفتاری نەفامانەی ئەبو لەهەبی مامی دەدایەوە.

ت- بۆ (حەسەنی بەسری) یان گێرایەوە، كە فلأن كەس لە پاشملە باست دەكات، و ئیرەییت پێدەبات، ئەویش سەبەتەیەك خورمای بۆ كەسەكە بردو نامەیەكی لەگەڵدا بەجێهێشت، تێیدا نوسیبوو: ((هەواڵم پێگەیشت كەتۆ چاكەكانی خۆت بەدیاری بۆمن ناردووە، وامنیش ویستم بەم دیارییە وەڵامت بدەمەوە))، ئەمەبوو خەڵاتی موسوڵمانی تێگەیشتوو بەرانبەر هەڵەو كاری نادروستی كەسێكی دیكە.

ئامانج لەبەرپەچدانەوەی خراپە بە چاكە، خۆپاراستنە لە خراپەكاری بەدكاران و هەوڵدان بۆ ریَ پیشاندانیان.

وانەی یانزەم

## سیماو دەرەنجامی ( بەرپەرچدانەوەی خرا پەکاری بە چاکە کردن )



**سیماکان:**

١- چاوپۆشیکردن لە هەڵەکاران.

٢- سۆزو میهرەبانی نواندن بەرانبەر کەسی بەزیو و روخاو.

٣- نەرمی نواندن لە بەرانبەر توند وتیژیدا.

**دەرەنجامەکان:**

١- پەیوەندی دوژمنکارانە دەگۆڕێت بە خۆشەویستی و ئاشتی.

٢- دەبێتە هۆی گۆڕینی تاکی شەڕانگێز و دوژمن، بۆ کەسێکی گونجاو ئاشتیخواز.

٣- دوای گۆڕین و چاکخوازی لەهەستی بەرانبەردا، خۆشەویستیەکی بەهێزو گەشەدار جێیدەگرێت.

٤- کۆمەڵگە بنیاتدەنێتەوەو ئاگری دەمارگیری و نەفامی خامۆش دەکات.

٥- زاری کەسانی دەمارگیرو گاڵتەجار، دەبەستێت لە وتەی نەشیاو.

ئەو شوێنەوارو دەرەنجامانەی باسکران، دانایی وپەروەردەی نەتەوەی ئیسلام نیشاندەدات، بەرانبەر خراپە کارو و بەدکاران.سەرقاڵی مرۆڤی ئەم سەردەمەو جۆراوجۆری ئامێرەکانی شارستانی ئەمڕۆ،بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی گرفتی نوێ بۆ مرۆڤەکان، وەك ئامێری (موبایل) کەدەکرێت بە خراپە بەکارهێنانی ببێتە مایەی بێزار کردن و وەرسکردنی کەسی بەرانبەر، بەڵام باشترین وەڵام ئارامگرتن و بێدەنگیە پەندێکی کۆن دەڵێت: ((وەڵامی نەفام بێدەنگیە)).

**چەند شێوازێك لە وەڵامی پەسەند بۆ هەڵەكاران:**

١- وەڵامی دابڕاو لە خزمایەتكردن دانەوە، بە پەیوەندی توندكردنەوە لەگەڵی.

٢- وەڵامی ئەو كەسەی سڵاوت لیّ ناكات بە سڵاولێكردنی.

٣- هەڵبژاردنی بێدەنگی و لێبوردن بەرانبەر جنێو وتەی نابەجیّ.

٤- لە بەرانبەر كەسی تووڕەو توندا، ئارامی و نەرمی نواندن.

٥- وەڵامی كینە لە دڵ بەدڵپاكی و ڕێزلێنان.

٦- لە ئاستی كەسی مۆندا روخۆشی و كراوەیی.

٧- بەرانبەر ئیرەییبردن دیاری بەخشین.

٨- وەڵامدانەوەی كەسی سەرسەخت بەرێنمایكردن و ڕێنیشاندان و، كەسی زۆر سەرسەخت، بە پشت هەڵكردن و بە جێهێشتنی.

٩- ئەو كەسەی بەپەلەیە ڕێی بۆ چۆل بكە.

١٠- وەڵامی ئەو كەسەی دەست لەكاری كەسانیتر وەردەدات بەگویّ لێگرتن و پاشان گویّ پێنەدانی.

١١- وازهێنان لە كەسی تێكچو لەباری ئەقڵیدا لەوەی دەیكات.

١٢- بەرانبەر ئەو كەسەی خۆپەسندەو خەلكی ناوێت، پرسیاری بێدەنگكەری ئاراستەبكرێت، تا لەوخۆپەسندیەی دابەزێت و پەند وەرگرێت، یان شەرەقسەی لەگەڵ نەكرێت.

١٣- سەرپێچیكار لەیاسا بە شێوازی نەرم سەرزەنشت بكەو، بەوە مەشقی بدەریّ لەسەر ڕێك و پێكی.



## راهێنانی (١)

١- ئامانج لەوەڵامدانەوەی خراپەکردن بە چاکەکاری چییە؟

٢- سیماکانی وەلامی چاك بۆ خراپەکاری چییە؟

٣- سێ شوێنەواری باشی، کردەوەی چاکەکاری بەرانبەر خراپەکاری بنوسە.

٤- کردەوەی چاکە کاری بەرانبەر خراپەکاری شێوازی زۆرە، تەنها سیان لەو کردارانە بنوسە.

## راهێنانی (٢)

وەڵامی راست لەنێوکەوانەکانی بەرانبەردا هەڵبژێرەو لەبۆشاییەکاندا بینوسە.

١- ئەگەر ویستم سەردانی دراوسێکەم بکەم بەڵام رێی پێنەدام و پۆزشی بۆ هێنامەوە، ئەوا...........(قسەی لێ دەبڕم- لە کاتێکی تردا سەردانی دەکەم گلەیی لێدەکەم کە پێشوازی لێنەکردم).

٢- ئەگەر بەهەڵەی شوفێری بەرانبەر ئوتومبێلەکانمان بەیەکدابدات، ئەوا..............(بەتوندی لێپێچینەوەی لەگەڵدەکەم- لێی خۆشنابم- ئارام دەگرم بەپێی یاساکانی هاتوچۆ رەفتاری لەگەڵ دەکەم).

## راهێنانی (٣)

دێرەکانی ستونی یەکەم بە دەستەواژەی گونجاو لە ستونی دووەمدا بگەیەنە.

| | |
|---|---|
| ١- کردەوەی چاکەکردن لە وەلامی خراپەکردندا پەیوەندی لە رەوشتێکی دوژمنکارانە دەگۆڕێت بۆ | ئاگری دەمارگیری و نەفامی خامۆشدەکات |
| ٢- کاری چاکەکردن بەرانبەر خراپەکاری | دۆستایەتی و رێزو دڵپاکی |
| ٣- مرۆڤی موسوڵمان لە بەرانبەر خزمی خەم ساردو دورەپەرێز | پەیوەندی خۆشویستن وپێکەوە گونجان |
| ٤- موسوڵمان وەڵامی کینە لەدڵ دەداتەوە بە | پەیوەندی توندوتۆڵ دەکات |

## راهێنانی (٤)

١- بەسەر هاتێك لە ژیاننامەی پێغەمبەرمان(د.خ) بەبەڵگە بێنەوە لەسەر بەرپەرچدانەوەی خراپەکاری بە چاکەکردن.

٢- بە رووداوێکی بەڵگەدار لە کۆمەڵگەی کوردەواریمان ئەوە بسەلمێنە کەسێك لە وەڵامی خراپەی یەکێکی دیکە چاکەی کردبێت.

## چالاکی

مامۆستا داوا لەخوێندکارانی دەکات، یەکێکیان ئاماژە بەوەبکات لەبەرپەرچدانەوەی خراپەی کەسێکدا، ئارامی گرتبێت و بەکاری بەد وەڵامی نەدابێتەوە.

- هەروەها داوابکات لە رێی دیالۆگەوە دوو قوتابی رووداوێك نمایش بکەن هەڵە بە هەڵە وەڵام نەدانەوەی تیدابێت.

وانەی دوانزەم

## ئامۆژگاری قورئانی



قورئانی پیرۆز سەرەرای ئەوەی پەرتوکی یاساگوزاری و ئەحکامە، رابەرو ئاراستە کارو رێنمایکار و روونکردنەوەشە، هەموو خێرو چاکەیەکمان نیشاندەدات، موسوڵمانان و گشت خەڵکیش ئاراستە دەکات بۆ رێی سەرفرازی و بەختەوەری دونیاو دوا رۆژیش، راست و دروست لە چەوتی و ناڕەوایی جیادەکاتەوە، رێی راست نیشانی مرۆڤ دەدات، بەسەر هاتی گەلانی پێشین و هەواڵی رابوردوی تێدایە، ئەوەی پێویست بە قوڵبونەوە بکات درێژەی پێداوەو پەندو ئامۆژگاری لێهەڵهێنجاوە، یەکێك لەو چیرۆکانە ئامۆژگاریە زۆربەپێزەکەی لوقمانە بۆ کورەکەی، کە بەدرێژایی مێژوو بە زیندویی هەردەمێنێتەوە، ئەمەش لە نهێنی و حیکمەتی قورئانە. خودای پەروەردەگار لە سورەتی لوقماندا دەفەرموێت: ((يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ)). (لقمان)

کە تیایدا لوقمان بە کورەکەی دەڵێت: نوێژو پەیوەندیت بەخودای خۆتەوە زیندوو رابگرە و لێی دامەبرێ و لەکاتی خۆیدا بەوشێوەی خودا پێی خۆشە ئەنجامی بدە.

هەروەها فەرمانکردن بەچاکەو رێگریکردن لەخراپە و خۆراگری و ئارامگرتن لەسەر ئەو رێبازە، کەئەمە لەکارە گرنگەکانە، وازی لێمەهێنە، چونکە ئەمانەن کۆمەڵگە بەختەوەرو ژیان پرمانادەکەن، پاشان پێی گوت: پشت لەکەس هەڵمەکەو لەسەرخۆو خۆبەکەم زان بە، بەسەر زەویدا نازمەکە چونکە خودا مرۆڤی فیزاوی و لوت بەرزی ناوێت. لەکۆتایدا پێی گوت: مامناوەندبە لە رۆیشتندا نە زۆرخێراو نە زۆرهێواش، مەگەر لەبەر پێویستیەك، هەروەها بادەنگت بەپێی پێویست بەرزبێت، تا دەوروبەر وەرس نەبن دەنگی تیژو هات و هاوار لە دەنگی گوێدرێژەوە نزیکە کە ناپەسندترین دەنگە.

## راهێنانی (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- بۆچی قورئانی پیرۆز ئامۆژگاری (لوقمانی بۆ کوڕەکەی ) تۆمارکردووە.

٢- هەندێك لەو کردەوە باشانە بلێ کەپێویستە موسوڵمان پابەندیان بێت.

٣- سەبارەت رێکردن لوقمان چی بەکوڕەکەی دەڵێت.

٤- ناوی ئەو سورەتە بلێ ئامۆژگاریەکەی لوقمانی تیدا تۆمارکراوە.

## راهێنانی (٢)

بۆشاییەکان بە وشەو دەستەواژەی گونجاو پڕبکەوە:

١- گرنگترین ئەرکی سەرشانی هەر موسوڵمانێك بە جێهێنانی .........ەکە..........پایە ئیسلامە.

٢- قورئانی پیرۆز وتەی ................کە کە دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی ..........تا ببێتە دەستوری ................ .

٣- و ............. علی ما أصابك، انّ ذلك من............... .



## لێبوردەیی و چاوپۆشیکردن

ئەم دووئاکارە بەشێکن لە مامەڵە رەوشتیەکانی مرۆڤ و زانستی رەوشتیش، زانستی مامەڵە کردنەو لەکردەوەکانی مرۆڤ و ئەو ئاکارانە دەکۆڵێتەوە، کە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا کۆکن.

لێبوردەیی و چاوپۆشیکردن بەواتایەکی دیکە لەوبەها کەسیانەن لەچوار چێوەیەکی گشتیدا بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو ئاراستە دەکرێن، هەر ئاکارێکی مرۆڤیش چوار واتای هەیە:

١- کاری پەسندو نابەجیّ.

٢- توانا بەسەر یاندا.

٣- ناسینیان.

٤- لادان بەرەو باری دروست یان ناپەسند.

خودای پەروەردگار رەوشتە هەرەبەرزەکانی لە ئایەتێکدا کۆکردۆتەوە، کە دەفەرموێت: ((خُذِ العَفْوَ وأْمر بِالعرُفِ وأَعرِضْ عَنِ الجاهلين)).(الاعراف١٩٩).

**بەها(بنەما)** رەوشتیەکان لە مامەڵەکردن لەگەل خەڵکیدا:

ئایەتی پێشو سیّ بنەمای لەخۆ گرتبوو سەبارەت مامەڵەکردن لەگەل خەڵکیدا:

**١- بنەمای یەکەم: پەیرەوکردنی لێبوردەیی:**

مەبەست لەم برگەیە ئاسانکاری و هێورکردنەوەیە بەبیّ(ئالۆزکردن ) یان (توندڕەوی) یا (نارەحەتی).

واتە: (لە ئاسانکردنێکدا قورسکردنی وەلانابێت).

(لەنەرمی و هێورکردنەوەکەیدا بیّ توندڕەوی).

(لە چاوپۆشیەکدا تیژی و تورەیی پێوە نەلکابێت).

ئەم چوار چێوەیەش ئاکارەکانی (لێبوردەیی بەرانبەر ستەم کردن، بەخشین بەرانبەر کەسێك بێبەشی کردبێت) لەخۆدەگرێت، هەروەها ئەو رەفتارانەی لەسەر بنەمای چاوپۆشی و ئاسانکاری و نەرم نواندن بیناکرابێت.

**٢- بنەمای دووەم- فەرمانکردن بە چاکە:**

کاتێك بەهۆی ئاسانکاری و چاوپۆشیەوە هەندێك کەس پێی لیّ رادەکێشن و بەسروشتی سپڵە یان یاخیبوون هەڵدەبژێرن، بەرانبەر لێبوردەیی کەسێك ئەوا خودای گەورە لە رێی پێغەمبەرەوە (د.خ) پێمان رادەگەیەنێت فەرمان بکەین بەچاکە لە چوارچێوەی شەریعەتدا، واتە: نە ستەم بکەین نە ستەمیش قبوڵ بکەین.

### ٣- بنەمای سێیەم- پشت هەڵکردن لەنەفامان :

لەوانەیە هەندێك کەسی نەزان بەگژ ئەوانەدا بچنەوە، کە فەرمانیان بەچاکە پێدەکەن و لە خراپە دووریان دەخەنەوە، وەڵامی ئەوانە نابێت بەهاوشێوەی ئەو نەفامیەی ئەوان یان جنێو پێدانیان و دەست درێژی بۆ سەریان بێت. بەڵکو پێویستی بەخۆڕاگری و حیکمەت بە کارهێنانە، کە رەنگە ببێتە هۆی پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەی ئەوان و پاراستنیش بۆکەسایەتی و پێگەی خۆمان.

جا ئەگەر مرۆڤەکان پابەندبن بەو سێ بنەمایەی لەسەرەوە هاتوون، ئەوا دڵئازاردان و کینە و رق لێبونەوەیان لە نێواندا نامێنێت و ئاشتی و پێکەوە ژیان دەبێتە سیمای کۆمەڵگە کەیان.

## نەرمی نواندن و سۆزیاری پێغەمبەر موحەمەد( د.خ )

باشترین بەڵگەو نیشانەی پابەندی بەو سێ بنەمایەی لەبابەتی پێشودا ئاماژەی پێکرا، ئەوەیە کەبەسۆزو میهری خۆی، خودای گەورە پێغەمبەرێکی (د.خ) دڵنەرم و میهرەبانی بۆ باوەڕداران هەڵبژارد، وەك لە قورئاندا فەرمویەتی:

((فَبِما رَحْمَةٍ مِنَ الله لِنْتَ لَهُم وَلَوْكُنْتَ فظاً غليظَ القلبِ لانفضوا من حولكَ فأعفُ عَـنْهمُ وأستغفرْ لَهُـم وشاورْهُم في الامرِ فاذا عَزَمْتَ فتوكَّلْ على الله إنَّ الله يُحِبُ المتوكلين)). **(آل عمران/١٥٩)**

واتە سۆزو نەرمی تۆ لەگەڵ گەلەکەت لەمیهرەبانی خوداوەیەو بۆ ئەوانیش رەحمەتە، چونکە ئەگەر تۆ دڵرەق و توندو تیژی گرژومۆن بوای لەگەڵیان بێگومان ئەوانیش لەدەورت کۆنەدەبوونەوە و بەجێیان دەهێشتی بۆیە بەم شێوەیەی خوارەوە رەفتاریان لەگەڵ بکە:

١- لێبوردەیی بەرانبەر هەڵەکانیان.

٢- داوای لێخوشبونیان بۆبکە لەخودا بەبەردەوامی.

٣- راوێـژیان لەگـەل بکـە لـە کاروبـاری جەنگـدا، مەگـەر کارێـك سروشـت بۆهاتبێـت، راوێـژکردن بنەمایەکی گرنگە لە شەریعەتی ئیسلامدا، سودەکەی بۆهەمووانە، پاشان پشت بەخودا بەستن لە بریارداندا، ئەمانە هەمووی دەبنە هۆی کۆمەك و یارمەتی خودای بەدەسەلات بۆمان.

چەند نموونەیەك لەسەر راوێژکردنی پێغەمبەر (د.خ) بە هاوەڵانی:

١- لە بەرەنگاربوونەوەی کاروانی قورەیشییەکان لەرۆژی جەنگی بەدردا.

٢- لە چوونە دەرەوەی شار لە جەنگی ئوحوددا بۆ دەوروبەری مەدینە.

٣- هەر بەراوێژ پلانی جەنگی ئوحودیان داناو لە هەڵەی سەرپێچی کارانیشی خۆشبوو.

### چاوپۆشی و لێبوردن لەهەڵە هاوتەریبی کاری چاکەیە

خودای پەروەردەگار لە قورئاندا فەرمویەتی: ((إِنْ تُبدُوا خيراً أو تخفوهُ أو تعفوا عن سُوءٍ فإن الله كان عفواً قديراً)) **(النساء ١٤٩)**.

کەخودای گەورە لێبوردەیی و چاوپۆشی لە هەڵەکاران، بە هاوشان و تەریبی کردەوە پەسندو باشەکان هەژماردەکات، دەبێت مرۆڤی موسوڵمان خاوەنی لێبوردن و دڵێکی گەورەبێت، تا قین و کینەی تیدا جێنەبێتەوە، لە وێنەی خوارەوە ئەو هاوکێشەیە بەدیدەکەیت.




## گفتوگۆ

١- (پێویستە وەلامی نەزان نەدەینەوەو پشتی لێهەڵکەین) ئەمە شیبکەوە.

**-نموونە بۆ ئەمانەی خوارەوە بێنەوە.**

١- راوێژکردنی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ هاوەڵانی.

٢- لێبوردەیی لەو کەسانەی سەرپێچییان دەکرد.

**- ئەو ئایەتە بلێ بەها رەوشتیەکانی تێدا کۆکراوەتەوە پاشان:**

١- بینوسە .

٢- ئەوسێ بنەمایە کامانەن ئاماژەی پێکردوون.

- خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر کرد (د.خ) چۆن بێت لەگەڵ کەسوکارو گەلەکەی؟ دەقێکی قورئان بلێ ئەو بنەمایە پشت ڕاستبکاتەوە.

وانەی پانزەم

## پاراستنی زمان لە بەد گۆیی

وتەی باش و پەسەند و لە سنووری ڕەزامەندی خودادا، نیشانەی باوەڕ و بەرهەمی پەروەردەی دروستە، ئەنجامەکەشی خێر و خۆشییە بۆ خاوەنی و کۆمەڵگە. ئەگەر ئادەمیزاد زمانی لە پشت ئەقل و بیرکردنەوە وەبێت، ڕاستیی پێ دەربڕێت بەختەوەرە و متمانەی کەسانی دی بە دەست دێنێت، خوداش لێ ڕازی دەبێت و ناوی لە نێو ڕاستگۆیاندا تۆمار دەکات. بەڵام ئەگەر زمانی بێ سنور بۆ دانان و درۆ گوتن و تێرکردنی ئارەزوو بەکارهێنا، ئەوا دەبێتە مایەی کێشە و ماندوو بوون بۆی و زیان بە خۆی و خەڵکی دیکەش دەگەیەنێت، دوا جاریش خودای گەورە سزای دەدات و لە ڕیزی درۆزناندا تۆماری دەکات.

ئەو کەسەی زۆر دەڵێت هەڵەش زیاتر دەکات، وتراوە ئەگەر قسەکردن زیو بێت ئەوا دەنگ نەکردن زێڕە. ئەمەیە ڕەوشتی باوەڕداران وپیاو چاکان و مرۆڤە ژیرەکان، چونکە هەر وشەیەك لەزار بێتە دەرێ چاودێری دەکرێت و تۆمار دەکرێت لەلایەن چاودێرانەوە، بۆیە پێغەمبەرمان (د.خ) هۆشیاری پێداوین بە فەرمودەی: ((مَن کان یؤمن بالله و الیوم الآخر فَلیقل خیراً أو لِیصمتَ)).

زمان هەروەك ئامێرێکی گرنگ و هەستیارە بۆ وشەی چاك و بەسود، گەر هۆشیارانە بەکارمان هێنا، دەشکرێت هۆکاریکی فریودەر و فەوتێنەر بێت، گەر خاوەنەکەی بێباك یان بێئاگا بێت لە چاودێری وشەکانی لەلایەن خودای گەورە. هەندێك لە نەهامەتی و ئافەتەکانی زمانیش:

ئ- درۆگۆیی: واتە زمانبازی بێ چاودێریکردن و دۆزینەوەی ڕاستی، وەك پێغەمبەرمان(د.خ) فەرمویەتی: ((**الکذاب بعید عن الله بعید عن الناس بعید عن الجنة**)). کە ئەوەش خاوەنەکەی سەر شۆر و بێ متمانە دەکات.

ب- غەیبەت کردن (باسکردنی پاشە ملە): جا ئەگەر باسکراو ئەو خاڵانەی تێدابوو پێی خۆش نەبوو باسکرێت ئەوە (غەیبەتە)، بەڵام ئەگەر تێیدا نەبوو، ئەوە بۆ هەڵبەستنە (بوهتان). ئامێری ئەم چالاکیەش هەر ئەو ئەندامە بچوکەیە خودای گەورە دەفەرموێت: ((..وَلَا یَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا..)) (الحجرات ١٢).

پ- قسە هێنان و بردن: ئەمەش سیفەتێکی نەنگە، زۆر جار کێشەی گەورە لە نێوان قسەبراو و قسەبۆبراودا لێدەکەوێتەوە. گومانیشت نەبێت، ئەوەی قسەت بۆ دێنێت قسەشت بۆ کەسانی دیکە دەبات.

ت- شایەتی درۆ: گەواهێدانە لەسەر ڕوداوو هەر دۆزێك بە ناراستی و گۆڕینی ڕاستیەکان، ئەمەش لە گوناهە هەرە گەورەکانە و لە ترسناکترین ئافەتەکانی زمانە، دەبێتە هۆی لە ناو چوون

و بەرپابوونی ستەم. کەواتە، قوتابییانی خۆشەویست، زمانتان بپارێزن لەو دەرد و نەهامەتیانە، بەڵکو زمان رابێنن بەیاد کردنی خودا و گوتنی راستی و چاکە، هەروەها دەتوانن بیکەنە هۆکاری پێکەوە ژیان و لێك گەیشتن و خۆشەویستی  و برایەتی. هەر زمانە خاوەنەکەی بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ رادەپێچێت.

پێغەمبەرمان (د.خ) لە بەشێکی فەرمودەیەکیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە: ئایا جگە لە زمان چیەکە دەبێتە هۆی بەرودا خستنی مرۆڤ لە ئاگردا. وتراوە (مرۆڤ بە دوو ئەندامە بچوکەکەی هەڵدەسەنگێنرێت، زمان و دڵ).پێغەمبەرمان (د.خ) لە بارەی بەکار هێنانی زمانەوە هۆشیاری داوە بەم فەرمودەیە:

**((علیكم بالصدق فان الصدق یهدي الی البر وان البر یهدي الی الجنة وایاكم والكذب فان الكذب یهدي الی الفجور، وان الفجور یهدي الی النار))**



## راهێنان (١)

هەربڕگەیەکی ستونی یەکەم بەبڕگەیی گونجاوی بەرامبەر لە ستوونی دووەمدا بگەیەنە:

| | |
|---|---|
| مرۆڤی زۆر بڵێ | دڵ و زمان |
| لەسەر قوتابییە | چاکە کاری و بەهەشت |
| درۆکردن | بێدەنگی زێرە |
| مرۆڤ بە دوو ئەندامە بچوکەکەیەتی | هەڵەی زیاتر دەکات |
| ئەگەر قسەکردن زیو بێت | ئارم و نیشانەی گوناهبارییە |
| راستگۆی دەمانبات بەرەو | زمانی لە شایەتی درۆ بپارێزێت |

## راهێنان (٢)

وەلامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- ئایا مرۆڤی درۆزن رێزی لێدەگیرێت؟

٢- سێ لە ئافەتەکانی زمان بڵێ.

٣- چارەنووسی باوەڕداری راستگۆ چۆنە؟

٤- جیاوازی لە نێوان پاشملە باسکردن و قسە هێنان و بردن چییە؟

٥- مەبەست لە شایەتی درۆ چییە؟

## چالاکی

- فەرمودەی پێغەمبەر سەبارەت راستگۆیی، لەبەر بکە.
- مامۆستا لە قوتابیانی دەخوازێت راپۆرت سەبارەت ئافەتەکانی زمان ئامادە بکەن.

وانەی شانزەهەم

## مافی ڕێ و بان




بەکارهێنانی ڕێ وبان مافی هەمووانە و ناکرێت هیچ کەس پاوانی بکات و مافی کەسانی دیکە پێشێل بکات. هەندێك جار کەسانێك ناچار دەبن لەو جێیانە دابنیشن خەڵکی هاتوچۆی لێوە دەکەن، ئەو ساتانەش لە ئاینی ئیسلام ڕێکخراوە، بەم فەرمودە پیرۆزەی سەروەرمان موحەمەد(د.خ) ((**اياكم والجلوس في الطرقات**)) قالوا يارسول الله، مالنا بد هي مجالسنا، نتحدث فيها؟ قال رسول الله (ﷺ): ((**فاذا ابيتم الا المجلس فاعطوا الطريق حقه**)). قالوا: وماحقه قال: ((**غض البصر، وكف الاذى، ورد السلام، والامر بالمعروف والنهي عن المنكر**)).

ئەمانەی خوارەوە ئەو ئەرکانەن کە پێویستە ڕەچاو بکرێن لە سەرە ڕێدا:

ئـ- چاو داخستن، واتە: نەڕوانین بۆ ڕەگەزی بەرامبەر بەشێوەیەك ئازار بدرێت و وەڕس بکرێت، قورئان دەفەرموێت: (( قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم))(نور-٣٠). پاشان دەفەرموێت: ((وقل للمؤمنات يغضضن من ابصارهن))(نور-٣١).

لەم ئایەتانە ڕوون دەبێتەوە کە تەماشاکردنی حەرامی کەسی جیا لە ڕەگەزدا هەنگاوی یەکەم و سەرەتایە بۆ کاری داوێن پیسی، کە مرۆڤی خوداناس خۆی لێدەپارێزی. پاشان سزای یاسایی و خودایێشی بە دواوەیە.

ب- خۆپارێزی لە چاودێری هەڵس و کەوتی خەڵك.

پ–کەسێك شتێکی کڕی یان بەدەستیەوە بینیت، نابێت کارت بەسەریەوە هەبێت.
ت–خۆ دوور خستنەوە لە ئاشکراکردنی عەیبی کەسانی دیکە و نهێنی درکاندنیان.

٢– وازهێنان لە زیان گەیاندن بە کەسانی تر،واتە:

ئ– واز هێنان لە تانەدان و رەخنە گرتن لێیان، یان نازناوی ناشیرین پێوە لکاندنیان یان جنێو پێدانیان.

ب– درۆیان بۆ هەڵنەبەسترێت لەکاتێکدا ئەوان بێ تاوانن.

پ–دڵشکاندن و سەرکۆنەکردن یان گاڵتە پێکردن، ئەمانەش هەر زیانگەیاندنە.

ت–کۆتاییهێنان بە تێکدانی نێوان خەڵك و قسە هێنان و بردن لە نێوانیاندا.

ج– زیادە رۆیی لە سەرماڤی کەسانی دیکە نەکرێت، وەك ئەوەی ئوتومبێل رادەگرێت لە بەردەم ماڵان، یان لە جێی گشتی و سەرە رێدا.

چ–دوور کەوتنەوە لە فڕێدان و بەجێهێشتنی پاشماوە و شتی بێ کەڵك لەسەرە رێ و شوێنی حەوانەوەی خەڵکدا.

ح–دوورە پەرێزی لە وەستانی بەردەم خوێندنگەکان و تانەدان بەتایبەت لە قوتابیانی کیژ.

خ–نەبێتە رێگری ئازادی تاکەکان بە تایبەتی دەوروبەر و دراوسێکان.

ز–بەرز نەکردنەوەی زیاد لە پێویستی دەنگ لەماڵ و لە کۆڵان و سەر شەقامەکان.

ك–خۆ دورگرتن لە تۆقاندن و دروستکردنی دڵەراوکێ بۆ کەسانی دیکە بە هەر شێوەیەك.

گ–ئازار نەگەیاندن بە هاوولاتیان بە هۆی : خواردنەوەی مادەی هۆشبەر و خواردنەوە گازیەکاندا و شوفێری بەسەرخۆشی و فڕێدانی دەفر و شوشەکەی لەسەر رێییەکاندا.

٣– وەڵامدانەوەی سڵاو کردن:

سڵاوکردن کردارێکی جوانە و سونەتیشە، بەڵام وەڵامدانەوەی ئەرکە، کە سڵاو کرا دەکرێت هەمووان وەڵام نەدەنەوە، بەڵکو وەڵامی هەندێك بەسە لە جیاتی ئەوانی دیکەش. باش وایە وەڵامەکە بە جوانتر لە سڵاو کردنەکە بێت وەك لە وەڵامی (السلام علیکم) دا بڵێت: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته)

٤– فەرمانکردن بە چاکە و رێگری لە خراپە:

ئەگەر هەندێك کەس ناچار بوون لە سەر رێی گشتیدا بوەستن یان لە رۆخی شەقامدا دابنیشن، کۆمەڵێك ئەرکی دیکە جگە لەوانەی سەرەوە باسکرا، دەکەوێتە ئەستۆیان، وەك: هاوکاریکردنی بە ساڵاچوان، بەزەیی هاتن بەلاوازەکان، یارمەتیدانی نەخۆشەکان، هاوکات رێگریکردن لە خراپە کردن و دەستدرێژی بۆ سەر ماف و ئازادی کەسانی دیکە.

## راهێنانی (١)

١- ئەو ئایەتە پیرۆزە بنوسە کە تیایدا خودای گەورە فەرمان بە باوەڕدارانی پیاو ژن دەکات چاویان لە ئاستی بێگانەدا دابخەن.

٢- فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بنوسە کە مافی ڕێ و بانی تێدا دیاریکراوە.

## راهێنانی (٢)

ئەم دوو وشەیە لە هەردوو بۆشای خودارەوە دابنێ:

(خۆپارێزی لە چاودێری هەڵس و کەوتی خەڵك،نا پاکیکردن بە چاو)

١- گەر کەسێك چاوی بڕیە ئافرەتی بێگانە بە پێی شەرع، کارەکەی ........ .

٢- مەبەست لە چاو داخستن........

## راهێنانی (٣)

١- موسوڵمان لە وەڵامدانەوەی سلاودا، پێویستە چی بڵێت؟

٢- ئەو کەسانەی ناچارن لە سەر ڕێی گشتیدا رابوەستن، پێویستە فەرمان بە چاکەکردن ئەنجامبدەن، بە نموونە، روونی بکەوە.

## راهێنانی (٤)

وەلامەراستەکانی نێو کەوانەکان بە کێشانی بازنە بە دەوریاندا دەستنیشان بکە:

خۆدورگرتن لە زیان گەیاندن بە خەڵك، واتە:

(بلاو کردنەوەی ئاشتی - دڵنیا کردنی خەڵك - درۆ هەڵبەستن - خۆدورگرتن لە درۆ هەڵبەستن - لە بیرکردنی هەڵبەستراو - ڕێز گرتن لە بە سالاچوان - خەڵکی بێزار کردن - چارەسەرە کتوپڕەکان - دەستدرێژی بۆ سەر کچان - بەکارهێنانی تەلەفۆن - یارمەتی نابینا لە پەڕینەوەدا).

## چالاکی

- فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) تایبەت بە ئادابی ڕێ وبان لە بەر بکەن.

## پایەکانی نوێژ و سونەتەکان



نوێژ پایەیەکی هەرە گرنگی نێو پەرستشەکانە لە ئایینی ئیسلامدا، مرۆڤی موسوڵمان بەهۆی نوێژەوە لە ناموسوڵمان جیا دەکرێتەوە. لەسەر چەندین پایە دامەزراوە و کۆمەڵێك سونەتیشی هەیە. ئومێدوایە بەهۆی بەجێهێنانیەوە خودا لە خۆمان رازی بکەین. ئەو پایە وسونەتانەش:

### ئـ- پایەکان:

١- نیاز (نییەت).

٢- گوتنی الله اكبر چوونە ناو نوێژ.

٣- بە پێوە وەستان گەر توانا هەبوو.

٤- خوێندنی سورەتی (فاتیحە).

٥- کرنوش بردن بە ئەندازەی وەستانی لەش لە جوڵە.

٦- راست بوونەوە بە هەمان شێوە.

٧- چونە سوژدە (نێو چەوان) لەسەر زەوی دانان بەهەمان شێوە.

٨- دانیشتنی نێوان هەردوو سوژدەی رکاتێك.

٩- دانیشتنی کۆتایی نوێژ بۆ خوێندنی (تەحییات - تەشەهود).

١٠- سلاوٌدانەوە بەلای راستدا.

### ب- مەرجەکانی:

١- هاتنی کاتی نوێژ.

٢- رووکردنە رووگە.

٣- پاك و خاوێنی.

٤- لەش داپۆشین (عەورەت).

**پ- سونەتەکانی:**

**ئـ - پێش چونە ناو نوێژ:** ١- بانگدان. ٢- قامەتکردن.

**ب- دوای چونە ناو نوێژ:**

١- خوێندنی تەحییاتی یەکەم.

٢- خوێندنی نزای قونوت لە نوێژی بەیانیان و، ویترەکانی نیوەی دووەمی رەمەزان.

**ت- ئادابی نوێژ:**

١- بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لەگەڵ وتنی (الله اكبر)ی نییەت هێنان.

٢- دانانی لەپی دەستی راست لەسەر پشتی دەستی چەپ.

٣- خوێندنی نزای نوێژ دەستپێکردن.

٤- وتنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە.

٥- خوێندنی قورئان بەدەنگی بیستراو لە نوێژی بەیانی و دووڕکاتی یەکەمی شێوان و خەوتنان. (لەلایەن پێش نوێژەوە).

٦- وتنی زیکری (ئامین) دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە.

٧- خوێندنی سورەتێك دوای سورەتی فاتیحە.

٨- لە نێوان بە جێهێنانی هە روکنێك گوتنی (الله اكبر).

٩- گوتنی (سمع الله لمن حمده، ربنا ولك الحمد) لە کاتی هەستانەوە لەکرنوش.

١٠- خوێندنی زکری کرنوش و سوژدە هەریەکەو لەکاتی خۆیدا.

١١- دانانی هەردوو دەست لەدوای ئەژنۆکانەوە لە دانیشتنی خوێندنی تەحییاتدا، بە کردنەوەی تەواوی دەستی چەپ و کۆکردنەوەی پەنجەکانی دەستی راست جگە لە پەنجەی شایتمان.

١٢- نوشتانەوەی هەردوو قاچ لە دانیشتنەکانی نوێژدا بۆ دواوە و راخستنی هەردوو پێ یان پێی چەپ.

١٣- سلاو دانەوە بەلای چەپدا، چونکە سلاو بۆ لای راست لە پایەکانی نوێژ بوو.

**ج- ئەو کارانەی نوێژەکە هەڵدەوەشێننەوە (بەتاڵی دەکەنەوە):**

١- قسەکردن بە ئەنقەست.

٢- جوڵەی زۆر (هەندێك زانا بە ٣ جوڵە دیاریان کردووە).

٣- دەستنوێژ شکان.

٤- هاتنە دەرەوەی پیسی و پاشەڕۆ لە لەشی نوێژکەرەوە.

٥- دەرکەوتنی لەش بە رووتی.

٦- نیاز (نییەت) گۆڕین.

٧- پشت لە روگە (قیبلە) کردن.

٨- خواردن و خواردنەوە لە نوێژدا.

٩- پێکەنین بە دەنگەوە (قاقا) لێدان.

## ح - نوێژە سونەتەکانی هاوڕێی فەرزەکان:

١. دوو رکاتی پێش نوێژی بەیانی.

٢. چوار رکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو رکاتی دوای نوێژ.

٣. چوار رکاتی پێش نوێژی ئێواران.

٤. دوو رکات دوای نوێژی شێوان.

٥. سیێ رکاتی دوای نوێژی خەوتنان کە رکاتی سێیەم تاکە و وتری پیێ دەوترێت.

## خ- نەوافل کە ٣ نوێژە:

١. شەو نوێژ.

٢. چێشتەنگاو.

٣. نوێژی تەراویح.

ئەو پایەو هەیئات و سوننەتانە وەك یەکن بۆ پیاو و ژن، تەنها لە چەند بوارێکدا ژنان جیا دەبنەوە وەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا هاتوە:

| لە نوێژی پیاواندا | لە نوێژی ژناندا |
|---|---|
| ١- ئانیشکەکانی لە جەستەی دوور دەخاتەوە چ لە کرنوش یان لە سوژدە. | ١- ئانیشکەکانی بە خۆوە دەلکێنی لە هەردوو حاڵەتت. |
| ٢- دەست بەرزکردنەوە لە نوێژدا لەو جێیانەی باسکراون. | ٢- گەر کەسی بێگانە گوێی لیێ بوو، دەنگ بەرز ناکات. |
| ٣- لەکاتی هەر روداوێك سبحان الله دەکات. | ٣- لەکاتی هەر روداوێك لەپی دەستی راستی ئەکێشێت بە پشتی دەستی چەپی دا. |
| ٤- روتایی پیاو نێوان ئەژنۆ بۆ ناوکە. | ٤- جگە لە روومەت و لەپی دەستی گشت جەستەی روتاییە. |

## گفتوگۆ

١- ئەو هۆکارانە چین نوێژ هەڵدەوەشێنەوە (بەتاڵ دەکەنەوە)؟

٢- جیاوازی نێوان نوێژی ژن و پیاو لە چیدایە؟

٣- جیاوازی نێوان پایەکان و سونەتەکانی نوێژ چییە؟

٤- ژمارەی رکاتی نوێژە سونەتەکان چەندن، چۆن دابەشکراون بە سەر نوێژە فەرزەکاندا.

## وانەی هەژدەم

# نوێژ کردن بەکۆمەڵ ( جەماعەت )

### چاکە و پلەی نوێژکردنی بە کۆمەڵ:

ئاینی ئیسلام بایەخ دەدات بەکاری بە کۆمەڵ، و دژ بە دووبەرەکی،چ لە رووی پەرستش یان مامەڵە و کاروباری رۆژانە. خودای پەروەردگار هەرکارێکی هەرەوەز بە پیرۆز ناوزەددەکات بە مەرجێك سود بەخش بێت و لە چوار چێوەی رەزامەندی دابێت. هەروەها پێغەمبەرمان (د.خ) بەم فەرمودەیەی خودارەوە جەخت لەسەر نوێژی بەکۆمەڵ دەکاتەوە کە دەفەرموێت:((صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفرد بسبع و عشرين درجة)).

واتە: نوێژ بە کۆمەڵکردن بە (٢٧) پلە باشترە لە نوێژ بەتاك کردن.لەبەر گرنگی بەکۆمەڵ نوێژکردن، تەنانەت بە دووکەس، واتە پێشنوێژ و کەسێك لەگەڵیدا، ئەو پاداشتەی بۆ (نوێژ کردنی بە کۆمەڵ) هەیە، دەیانگرێتەوە. تا ژمارەشیان پتربێت لای خودا باشتر و پاداشتیش زیاترە. وەك سەروەرمان (د.خ) دەفەرموێت: **((صلاة الرجل مع الرجل ازكى من صلاته وحده وصلاته مع الرجلين ازكى من صلاته مع الرجل وما كان اكثر، فهو أحب الى الله تعالى))** ئەحمەد و ئەبو داود و نسائی گێڕاویانەتەوە. واتە: نوێژیٚ بە دوو کەس پێکەوە بکرێت لە نوێژی تاکە کەس و بەسیٚ کەس لە دوو کەس و هەروەها تا ژمارەیان زیاتر بێت، لای خودا پاداشتی زیاتر دەست دەکەوێت.

پلە و فەزڵی جێی (نوێژی بە کۆمەڵ):

١- ئەنجامدانی نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوتدا پلەی باشترە لە هەر جێیەکی دیکە.

٢- ئەگەر نەکرا نوێژەکە لە مزگەوتابێت، ئەوا لە جێی بۆ دیاریکراو بێت. لە قوتابخانەکان یان فەرمانگە یان ریٚ، ئەوا باشترە.

٣- پاداشتی نوێژی مزگەوتێك هەنگاوی زیاتری بۆ بنرێت، پترە. بۆ ژنان هەیە، نوێژی کۆمەڵ لە مزگەوت و لە پشت پیاوان رابوەستن.

### گفتوگۆ

١- پلەی نوێژی بە کۆمەڵ روونبکەوە.

٢- بە بەڵگە روونی بکەوە نوێژی بە کۆمەڵ پلەی زیاترە.

٣- نوێژی بە کۆمەڵ بە دوو کەس ئەنجامدەدرێت؟

٤- ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:

١- پاداشتی نوێژی........زیاترە لە نوێژکردن بە تاك.

٢- ئەنجامدانی نوێژ بە کۆمەڵ لە ........ دا چاکەی زیاترە لە هەر جێیەکی دیکە.

٣- ژنان بۆیان هەیە نوێژ بە کۆمەڵ ئەنجامبدەن لە .......

٤- تا ژمارەی نوێژ کاران پتر بێت لە نوێژی .........لای خودا باشترە.

# نوێژی هەینی

## پلەی نوێژی هەینی :

ئەم رۆژە رۆژی حەسانەوەیە بۆ مرۆڤی موسوڵمان، پلەی لە رۆژەکانی دیکە بەرزترە، تیایدا موسوڵمانان یادی خودا دەکەن و پەرستشی زیاتر ئەنجامدەدەن، دەچنە مزگەوتەکان بۆ ئەنجامدان و بەجێگەیاندنی نوێژی هەینی و گوێگرتن لە گوتاری هەفتانەی گوتار بێژ.

## حوکمی نوێژی هەینی

ئەم نوێژە لەسەر موسوڵمانانی (نێرینە) ئەرکە، بەپێی ئەم ئایەتە:

**((یا ایها الذین آمنوا اذا نودي للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذکر الله وذروا البیع ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون)) (الجمعة ٩).**

## مەرجەکانی :

١- تەنها لەسەر نێرینە ئەرکە.
٢- لەسەر منداڵ ئەرك نییە تا دەگاتە ئاستی پێگەیشتن (بلوغ).
٣- کەسی نەخۆش نوێژی (هەینی) لەسەر نییە.
٤- رێبوار ناگرێتەوە ئەگەر بواری هەبێت بیکات ئەوە باشترە.

## چەند مەرجێك سەبارەت بەجێ گەیاندنی نوێژەکە :

١- ئاوەدانی (شار یاخود گوند): واتە نابێت نوێژی هەینی لە رێی سەفەر، یان جێی چۆڵ ئەنجام بدرێت.
٢- مزگەوت: یان بینایەك ناوی مزگەوتی لێنرابێت.
٣- وتار خوێن: نوێژی هەینی بێ گوتار دانامەزرێت.
٤- کۆمەڵ: بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك نوێژکەر. سەبارەت ژمارەیان چەند رایەك هەیە.

تێبینی: لە شەرعی ئیسلامدا ئەندازە و جۆرەکان بۆ ئامادەبوونی نوێژی هەینی دیاریکراوە.

وانەی بیستەم

## سودەکانی نوێژی هەینی



١- بە گوێگرتن لە گوتاری هەینی نوێژکەر سوودمەند دەبێت.

٢- ئاگاداری سەبارەت رووداو و گۆرانکاری سەر گۆرەپانی جیهانی ئیسلامی لە چەندین روەوە پەیدا دەبێت.

٣- موسوڵمان لەو پێکەگەیشتنەدا هەواڵی یەکدی دەزانن و پەیوەندی نێوانیان توند و تۆڵتر دەبێتەوە.

### چەند ئادابێکی نوێژی هەینی :

١- خۆشتن خۆ بۆن خۆش کردن.

٢- پۆشینی بەرگی خاوێن.

٣- چوون بۆ مزگەوت، پێشوەخت.

٤- وازهێنان لە کرین و فرۆشتن وشتی دیکە لەو کاتانەدا.

٥- خۆدوور گرتن لە خواردنی هەندێك مادەی بۆندار وەك: سیر، پیاز.

٦- پاراستنی بێدەنگی لە کاتی گوتاری هەینیدا.

٧- نزا و پاڕانەوەی زۆر و سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (د.خ).

## ئەو کارانەی نوێژ خوێن دوای چونی بۆ نوێژی هەینی، ئەنجامی دەدات:

١- لەگەڵ چوونە ناو مزگەوت دوو رکات نوێژی (تحیە المسجد) ئەنجام دەدات.

٢- چەند بوار هەبوو نوێژی سوننەت ئەنجام بدات (پێش وتاری هەینی).

٣- گوێگرتن لە وتاری هەینی بە بێدەنگی و ئارامی و ملکەچییەوە.

٤- وتار خوێن دوای وتارەکەی لەسەر دوانگە دێتە خوارێ و پێشنوێژی دەکات بۆ ئامادەبووان، نوێژی هەینی، دوو رکاتە و پێشنوێژ بە دەنگی بیستراو قورئانەکەی تیا دەخوێنێت.

## چەند سەرپێچیەکی موسوڵمانانی نوێژ خوێنی هەینی:

١- دواکەوتن لە چوون بۆ مزگەوت.

٢- هەنگاونان بەسەر نوێژ خوێنانی دیکە و ئازاردانیان.

٣- پشتکردنە وتار خوێن لە کاتی وتاریدا.

٤- خەو بردنەوە لەکاتی گوتارخوێندندا.

٥- قسەکردن لەکاتی گوتاردا یان نانەوەی دەنگە دەنگ.

٦-گوێنەگرتن لەوتار و خۆ خەریککردن بە تەسبیح و هەرشتێکی دیکەوە.



## گفتوگۆ

١– کاتی نوێژی هەینی کەی دەبێت؟

٢– بەبەڵگە ئەرکبوونی نوێژی هەینی بسەلمێنە؟

٣– مەرجەکانی ئەرکبوونی نوێژی هەینی بڵێ؟

٤– مەرجەکانی دروستی نوێژەکە چین؟

٥– سوودەکانی نوێژی هەینی کامانەن؟ بیانژمێرە.

٦–گرنگترین ئادابەکانی نوێژی هەینی چین؟

٧–نوێژی هەینی چەند رکاتە؟ خوێندنی قورئان تیایدا بێدەنگە یان بەدەنگەوەیە؟

٨–هەندێك لەو کارانەی نوێژ خوێنی نوێژی هەینی ئەنجامیان بدات بە سەرپێچی دادەنرێن، بژمێرە؟



## نوێژی جەژن



### پلە و پایەی هەردوو جەژنەکە:

لە ئاینی ئیسلامدا دوو جەژن هەیە کە موسوڵمانان خۆشی دەردەبڕن تیایاندا:

١- جەژنی رۆژو شکاندن (رەمەزان): دوای تەواوبوونی مانگی رەمەزان، موسوڵمانان خۆشی دەردەبڕن و جەژن دەگێڕن، بەهۆی زاڵبوونیان بەسەر دەرون و بەرۆژو بوونیان لە مانگێکی تەواودا، بۆیە یەکەم رۆژی مانگی شەوال بە جەژنی رۆژو شکاندن دادەنرێت، وەك سوپاسکردنی خودای گەورە لەسەر تەواو کردنی رۆژوی ئەو مانگە.

٢- جەژنی قوربان: یادکردنەوەی رزگاربوونی (ئیسماعیل) پێغەمبەرە لەسەر بڕین و، هاوبەشیی حاجیانە لە خۆشیی حەجکردندا، ئەویش رۆژی (١٠)ی زیل حەجەیە.

### لە واتاکانی جەژن:

١- خۆشنودی موسوڵمانان بەتەواوکردنی فەرزی رۆژوگرتن، هەروەها هاوبەشی حاجیەکانی ماڵی خودا لە بەجێهێنانی رێورەسمی حەجدا.

٢- کۆبونەوەی موسوڵمانانی هەر ناوچە و ناوەندێك لە مزگەوتەکاندا وەك بەرجەستەکردنی سروتە ئاینیەکان.

٣- سەردان و پیرۆزبای جەژنکردن لە یەکدی، بەمەبەستی بەهێزکردنی برایەتی و پەیوەندی نێوانیان.

٤- کەناڵێکی هاوکاریکردنی هەژار و دەستکورتانە، بە پێبەخشینی سەرفترە (سەدەقەی فیتر) لە جەژنی رەمەزان، و قوربانی و خێرکردن لە جەژنی قورباندا.

## ئادابی (رێ و رەسمی) نوێژی جەژن:

١- خۆشتن و بۆنخۆشی و پۆشینی بەرگی خاوێن و جوان.

٢- خواردنی چەند پارچە شیرینیەك پێش چوونە دەرەوە بۆ نوێژی جەژن، لە جەژنی رەمەزاندا، وەك هێمایەك بۆ بە رۆژو نەبوون.

٣- چوونی پێشوەخت بۆ نوێژی جەژن.

٤- گوتنی بەردەوامی الله اکبر و یادی خودا لەو رۆژانەدا.

٥- پیرۆزبایی ئاراستەکردنی موسوڵمانان بە وشەی (تقبل الله منّا و منکم) واتە: خودا لە ئێمە و ئێوەش قەبوڵبکات.

٦- سونەتە لەو رێگەیەوە نەگەرێیتەوە بۆ ماڵەوە، کە پێیدا چوویت بۆ نوێژی جەژن.

٧- ئەم نوێژە سونەتەو باشتر وایە منداڵان و ئافرەتانیش تێیدا بەشدار بن.

## چۆنیەتی نوێژی جەژن:

١- بە چەند خولەکێك دوای رۆژهەڵاتن موسوڵمانان ئامادەی نوێژی جەژن دەبن لەماڵی خودادا.

٢- نوێژی جەژن نە بانگی بۆ دەوترێت نە قامەتی پێویستە، پێش نوێژیش بە دەنگی بیستراو ئایەتەکان دەخوێنێت.

٣- ژمارەی رکاتەکان نوێژی جەژن دوانە، و بەم شێوەیە:

ئـ- پێش نوێژ و نوێژ خوێنان، دوای (الله اکبر)ی نوێژ دەستپێکردن حەوت(٧)جار (تەکبیر) دەکەن پێش خوێندنی سورەتی فاتیحەی رکاتی یەکەم، و پێنج(٥)جاریش بەهەمان شێوە لە رکاتی دووەمدا.

ب- دوای ئەنجامدانی نوێژی جەژن، وتار خوێن دەچێتە سەر دوانگە بۆ خوێندنەوەی وتاری جەژن.

٤- دوای تەواو بوونی وتارەکە و هاتنە خوارەوەی وتارخوێن لەسەر دوانگە ئامادەبووان جەژنە پیرۆزە لە یەکدی دەکەن.

## گفتوگۆ

١- جەژنی رەمەزان رێزلێنانێکی خوداییە لە موسوڵمانان، هۆی ئەم رێزگرتنە چییە؟

٢- لە کام جەژندا و کەی قوربانی دەکرێت؟

٣- گرنگترین رێ و رەسمی (ئادابی) جەژن چییە؟

٤- نوێژی جەژن چەند رکاتە؟ جیاوازی نێوان ئەم نوێژە و نوێژی هەینی چییە؟

٥- گرنگترین واتا بەرزەکانی جەژن، کامانەن؟

٦- نیشانەی ( ✓ ) لەبەردەم دەستەواژەی راست و نیشانەی (×) لەبەردەم هەڵەکان دابنێ:

ئ- نوێژی جەژنەکان لەماڵەوە دەکرێت.

ب- پێش چوونە نوێژی جەژنی رەمەزان باش نییە هیچ بخورێت.

پ- نوێژی جەژن بانگدانی پێویست نییە.

ت- گوتاری جەژن پێش نوێژی جەژن ئەنجام دەدرێت.

## نوێژی سەفەر

خـودای میهرەبـان مۆڵـەتی داوە نوێـژکردن لـە سـەفەردا کـورت و کۆبکرێتـەوە، بـە مەبەسـتی ئاسانکاری و پاساو نەهێنانەوە بۆ نوێژ نەکردن. بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- کورتکردنــەوە:** بریتییە لـە کورتکردنـەوەی نوێـژە چوار رکاتیـەکان بـۆ دوو رکـات بـەڵام نوێـژی بەیانی و شێوان ناگرێتەوە. بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ((وإذا ضَرَبتُم في الأرض فليسَ عليكم جُناحُ أنْ تقصروا من الصلاة)) **(النساء ١٠١)**. هەروەها فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) ((**صدقة تصدَّق اللهُ بها عليكم فاقبلوا صَدَقته**)) کۆ دەنگی لەسەرە.

**حوکمی کورتکردنەوە:**

سونەتێکی گرنگە و مۆڵەت و خەڵاتی خودایە بۆ بەندەکانی.

ئەندازەی مـاوەی کورتکردنـەوەی نوێـژی سـەفەر: زانایـان فەرمویانـە ئەندازەکـەی ٨٤ کیلۆمـەتر و سەروترە، ئەو ئەندازەیە بە هەر هۆکارێکی رێگابڕین و (سواری) بێت جیاوازی نییە.

**تێبینی:** ئـەو رێبـوارەی لـە پشـت پێشـنوێژێکی نیشـتە جێـوە نوێـژبکات نابێـت نوێـژ کورتبکاتـەوە بەڵکو لەگەڵیان تەواوی دەکات.

**٢- کۆکردنەوەی دوونوێژ:** بەم شێوەیە دەبێت

ئ – نوێژی نیوەڕۆ + نوێژی ئێوارە، کۆدەکرێتەوە، یان لەگەڵ نیوەڕۆ، یـاخود بـە کۆکردنـەوەی دوا خراو واتە نیوڕۆ بردنە لای نوێژی ئێوارە.

ب – نوێژی شـێوان + نوێـژی خـەوتنان، یـان بـە پێشخسـتنی خـەوتنان لەگـەڵ شـێواندا یـان بـە پێچەوانەوە، بە کام شێوە ئاسان بوو بۆ رێبوار ئاساییە.

پ– نوێژی بەیانی، لەگەڵ هیچ کام لە نوێژەکانی دیکەدا کۆناکرێتەوە.

**چۆنیەتی کۆکردنەوە و کورتکردنەوەی نوێژەکان:**

١– نوێژی نیوەڕۆ بە دوو (٢) رکات و سلاودانەوە.

٢– نوێژی ئێوارە بە دوو (٢) رکات و سلاو دانەوە.

٣– لە نێوانیاندا نوێژی سونەت و قسەکردن و شتی دیکە ناکرێت.

## گفتوگۆ و چالاکی

١- دانایی و پەند لە بڕیاردان لەسەر نوێژی سەفەر چییە؟

٢- کورتکردنەوەی نوێژ چۆنە؟

٣- مەبەست لە کۆکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا چییە؟

٤- چۆنیەتی (کورت و کۆ) کردنەوەی نوێژی ئێوارە لە پێشخستندا باس بکە؟

٥- نوێژی سەفەر بۆ ڕێبوار........ گرنگە و هەردوو نوێژی ........و ........ کورت ناکرێنەوە، زانایان ئەندەزای ماوەی نوێژی ڕێبوارانیان بە ........ کیلۆمەتر داناوە و نوێژی شێوان لەگەڵ ......... کۆدەکرێتەوە.

٦-شیکاری ئەم رستانە بکە:

١- ڕێبوار نوێژەکەی بە تەواوی دەکات، گەر لە پشت پێشنوێژی نیشتەجێوە نوێژی کرد.

٢- نوێژی بەیانی لەگەڵ هیچ نوێژێکی دیکە کۆناکرێتەوە.



## وانەی بیست و سێیەم

## نوێژە بارانە ( صلاة الاستسقاء )



**گرنگی ئەم نوێژە:** ژیانی ئادەمیزاد و گیانەوەران و روەك بە ئاوەوە بەندە، خودای گەورە دەفەرموێت: ((وجَعَلْنا مِنَ الماءِ كُلَّ شيءٍ حي)) (الانبياء٣٠) لە کاتی دوا کەوتنی باران و وشکە ساڵیدا، موسوڵمانان پەنا بۆ پاڕانەوە و نوێژە بارانە دەبەن، بە ئومێدی باران بارین، ئەمەش سونەتێکی چەسپاوە.

### چۆنیەتی ئە نجامدانی نوێژەکە :

باش وایە پێشەوای موسوڵمانان پێش چەند رۆژێك رایگەیەنێت، تا موسوڵمانان خۆ ئامادەبکەن بۆ نوێژە بارانە و پەشیمان بوونەوە(تۆبە) و واز لە گوناهەکان بێنن و پابەندی پەرستش بن.

ئەم نوێژە بانگی بۆ نادرێت، نە قامەت، بەڵکو بە وشەی (الصلاة جامعة) بەرپا دەبێت، باشتر وایە نوێژکەران بچنە دەرەوەی شار یان گوند، و تەنانەت گەر ئاژەڵ دار بوون پێش خۆیانی بخەن.

ژمارەی رکاتەکانی ئەم نوێژە دوانە و پێش نوێژ بە دەنگی بیستراو ئایەتەکان دەخوێنێت و زیکرەکان دەکات، وەك نوێژی جەژن ئەنجام دەدرێت. لە رکاتی یەکەمدا دوای فاتیحە سورەتی (أعلی) و لە رکاتی دووەمدا سورەتی (غاشیە) لەلایەن پێشنوێژەوە دەخوێنرێت. پاشان وتار دەخوێنێت و نزا و پاڕانەوە بۆ باران دەکات و نوێژ خوێنان ئامین دەکەن.

پێشنوێژ رووده‌کاته‌وه روگه و پۆشاکی سه‌ره‌وه‌ی به‌ری خۆی، قۆلی راست به‌لای چه‌پدا و چه‌پ به‌لای راستدا هه‌ڵده‌گێرێته‌وه و ده‌یپۆشیت. نوێژ خوێنانیش به هه‌مان شێوه و پاش پاڕانه‌وه بڵاوه‌ی لێده‌که‌ن.

**نزا و پاڕانه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر (د.خ) له نوێژه بارانه‌دا:**

((اللهم أسقِنا الغيثَ ولا تَجعلنا من القانطِينَ، اللهم أنبِت لنا الزرعَ، وأنزِل علينا بركات السماء، وأنبِت لنا من بركات الارض، اللهم اكشف عنّا البلاءَ، اللهم إنا نستغفرك، انَّك كُنتَ بنا غفّاراً، فأَرسلِ السماءَ علينا مدراراً، اللهُمَّ إسقِ عبادَك، وبهائمك، وانشُر رحمتَكَ، وأَحيِ بلدَك الميِّت)).

## گفتوگۆ

١- واتای نوێژه بارانه (صلاة الاستسقاء) چییه؟

٢- حوکمی نوێژه بارانه چیه و چه‌ند رکاته؟

٣- نوێژه بارانه جیاوازی له نوێژی جه‌ژن چییه بینوسه؟

٤- له نوێژه بارانه‌دا ....... ناوترێت، هه‌روه‌ها ....... ناکرێت، به‌ڵکو به وشه‌ی ......... بانگی بۆ ده‌کرێت. باشوایه له ........... شار ئه‌نجامبدرێت. باشتریشه پێشه‌وای موسوڵمانان به .......... پێش نوێژه‌که رایگه‌یه‌نێت.

٥- نزای نوێژه بارانه چۆنه؟ له‌به‌ری بکه.

وانەی بیست و چوارەم

## نوێژی خۆر گیران و مانگگیران



خۆر و مانگ نیشانە و بەڵگەن لەسەر مەزنی بەدیهێنەریان، گەر زەوی کەوتە نێوان خۆر و مانگ ئـەوا (مـانگ گـیران) روو دەدات، کـاتێکیش مـانگ دەکەوێتـە نێـوان خـۆر و زەوی خـۆر گـیران روودەدات. لە ئاینی ئیسلامدا بە سونەت دانراوە لە کاتی روودانی ئەو دوو دیاردەیەدا دوو رکات نوێژ بکرێت.

### چۆنیەتی نوێژەکە :

دوو رکاتە و قورئـانی زۆریـان تیـا دەخـوێنرێ و لـە کڕنوشـدا یـادی زۆری خـودا دەکرێت. ئـەم نوێـژە چـوار سـوژدەی تێدایـە. ئـەم فەرموودەیـە دەیسـەلمێنێت نوێژەکـە سـونەتە: ((انَّ الشّـمسَ والقمر آيتـان من آيـات الله لا ينكسفان لموت أَحد ولا لحياته، فاذا رأْيتم ذلك فَصَلّوا وادعـوا الله تعالى)) (بوخاری و موسلیم دەیگێڕنەوە).

باشترە بـە کۆمـەڵ بکرێت و بـە (الصـلاة جامعة) نوێـژ خوێنی بۆ بـانگ دەکرێت و، سونەتیشـە پاش نوێژەکە وتار بخوێنرێت.

### گفتوگۆ

١- هۆکاری خوێندنی نوێژی خۆرگیران چییە؟

٢- ئایا لەو نوێژانەدا سوژدە هەیە؟

٣- ئایا دوای ئەو دوو نوێژە وتار خوێندنەوە هەیە؟

## وانەی بیست و پێنجەم

## نوێژی مردوو

### گرنگیی ئەم نوێژە:

مرۆڤ لە ئاینی ئیسلامدا رێزدارە، زیندو بێت یان مردوو. کاتێکیش کۆچی دوایی دەکات لە ئیسلامدا ئەم کارانەی لە بەرانبەردا دەکرێت:

١- شتن و بۆنخۆشکردن و کفن لەبەرکردن.

٢- نوێژی لەسەر دەکرێت لەلایەن موسوڵمانانەوە.

٣- دەبرێت بۆ گۆڕستان، بە خاکی دەسپێرن و بۆی دەپاڕێنەوە.

٤- هاوبەشی خەم و پەژارەی خاوەن مردوش بە پێویست دانراوە.

### بەڵگە لەسەر پایەی ئەم نوێژە:

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: **((من شهد الجنازة حتى يُصلى عليها فلهُ قيراط، ومن شهدها حتى تدفن فله قيراطان، قيل: ما القيراطان: قال مثل الجبلين العظيمين))**.

### حوکمی نوێژەکە:

ئەم نوێژە (فەرزی کیفایە)یە، واتە بە ئەنجامدانی لەلایەن کۆمەڵێکەوە، ئەرکەکە لە ئەستۆی هەموان دەکەوێت.

### چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژی مردوو

ئەم نوێژە نوشتانەوە و سوژدە و دانیشتنی تێدانییە، خوێندنی قورئان و زیکر و نزاکانیشی لە لایەن پێشنوێژ و نوێژ خوێنانەوە هەر بە بێدەنگیە، رێ و شوێنی وەک لای خوارەوەیە:

١- جەستەی مردوەکە رووەو روگە دادەنرێت.

٢- نوێژ خوێنان لە پشت پێشنوێژەوە ریز دەبەستن و روو لە روگە دەکەن، ژمارەی ریزەکان سێ ریز بێت باشترە.

٣- پێشنوێژ چوار تەکبیرە واتە (الله اکبر) دەکات و هەر جارەی دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و نوێژ خوێنان بە دوایدا بە هەمان شێوە، وەک لای خوارەوە دیاریکراوە:

ئ- تەکبیرەی یەکەم: چونە نوێژ.

ب- دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە بەبێدەنگی جاری دووەم (الله اکبر) دەکرێت.

پ- ئینجا خوێندنی زیکری سەلاوات بەم شێوەیە ((اللهم صلِّ على محمد وآل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل

ابراهيم انك حميد مجيد)) لای کەمی سەڵاواتەکەش ئەمەیە: (اللهم صلّ على محمد وآل محمد كما صلّيت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انّك حميد مجيد). پاشان تەکبیرەی سێیەم (الله اكبر).

ت- خوێندنی چەند نزایەك بۆ لێخۆشبوون لە مردوەکە، گەر منداڵیش بوو خوێندنی نزا بۆ باوك و دایکی، پاشان گوتنی (الله اكبر) ی چوارەم و سڵاودانەوە، وەك هەر نوێژێکی دیکە. هەموو ئەم زیکرانە بەراوەستاوی و بەپێوە دەبێت.

دوعا بۆ مردوو بەم شێوەیە سوننەتە:

((اللهم اغفر لحينا وميتنا، وشاهدنا وغائبنا، وصغيرنا وكبيرنا، وذكرنا وأنثانا، اللهم من احييته منا فاحيه على الاسلام ومن توفيته منا فتوفه على الايمان، اللهم ان كان محسناً فزد في احسانه وان كان مسيئاً فتجاوز عنه... ياأرحم الراحمين)).. یان هەر دوعایەکی دیکە.

دوای تەکبیرەی چوارەم باشوایە بڵێن: ((اللهم لا تحرمنا أجره (ها) ولا تفتنّا بعده (ها)). پاشان سڵاو بدرێتەوە.

**ئەو داب و نەریتانەی شەرع قەدەغەی کردون لە کاتی مردنی کەسێکدا :**

١- لە خۆدان و بەروومەت و سنگا کێشان، یان قژ رنینەوە.

٢- دەنگ بەرزکردنەوە و هاوار و گریانی لاواندنەوە...هتد.

٣- پیاهەڵدان و هەڵبەست خوێندنەوە بۆ مردوەکە بە شێوەی سەردەمی نەفامی.

٤- دانانی جەستەی مردوەکە لە پێش دەمی نوێژ خوێنان.

٥- ئامادەبوونی سەرگۆڕستان لەلایەن ژنانەوە لە کاتی بەخاك سپاردنی مردودا.

## گفتوگۆ

١- ئەو کارانە چین پێویستە ئەنجام بدرێن بۆ کەسی مردو؟

٢- چەند تەکبیرە لە نوێژی مردودا هەیە؟

٣- بەڵگە لەسەر گرنگی و پایەی نوێژی مردو چییە؟

٤- ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:

نوێژی مردو فەرزی ........ نوێژێکە بەبێ .......... و ........... و ............•

خوێندنی قورئان و زیکرەکان تێدا بە شێوەی........... باشتریشە نوێژ خوێنان لە .......... ریزدا بوەستن.

٥- پاڕانەوە لە نوێژی مردودا چۆنە؟ کام شێوەت لەبەرە بیڵێ.

٦- ئەی پاڕانەوە لە نوێژی مردویەکدا کە منداڵ بێت، چۆنە؟

٧- چەند داب و نەریتێکی نەشیاو لە کاتی مردنی کەسێکدا بڵێ؟

## ڕێ و ڕەسمی پرسە

**پرسە :** واتە سەرەخۆشی لە خانەوادە و کەسی نزیکی مردو، هاندانیان بۆ ئارامگرتن هەروەها ڕازی بوون بە ویست و قەدەری خودا.

### چەند شێوازێکی سەرە خۆشی و پرسە :

هەر وشەیەك یان دەستەواژەیەك، بەسەر هاتەکە لەسەر دەوروبەر ئاسان بکات و ببێتە مایەی لە بیرکردن و دڵدانەوەیان. لەو بێژانەش، وەك پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: ((إن لله ماأخذَ، ولە ما أعطی، وکل شيءٍ عنده بأجلٍ مسمّی، فَلتصبر و لتحتَسِب)) بوخاری ریوایەتی کردووە.
واتە: هەموو شتێك وەرگرتنەوە و بەخشینی هەر هی خودایە و بەدەست خۆیەتی، هەموو شتێکیش ماوەی دیاریکراوە. کەواتە ئارام بگرن و چاوەڕێی پاداشت بن، هەروەها ئەم بێژانەش لە پرسەدا دەوترێن: ((اعظمَ الله اجرکم وأحسن عزاءکم وغفر لِمَیِّتکم)). واتە: خودا پاداشتی گەورەتان بداتەوە و باشترین دڵدانەوەتان بکات و لە مردوەکەشتان خۆشبێت.

### ڕەوایەتیی پرسە و سەرە خۆشیکردن :

کارێکی پەسەندە، چەندین فەرمودە لەو بارەیەوە هاتووە، وەك: ((مَن عزی مصاباً فله مثل أجره)).
واتە: هەرکەس سەرە خۆشی لە خاوەن مردویەك بکات، وەك ئەو خاوەنی پاداشتە. پرسە لە پیاو و ژن و منداڵیش دەکرێت.
سەرە خۆشیکردن دوای ناشتنی مردو تەنها سێ ڕۆژە. مەگەر کەسانێك لە دوورەوە بێن یان بێئاگابن، کە دەکرێت دوای ئەو سێ ڕۆژەش سەرەخۆشی بکەن.

### خۆراك بردن بۆ خاوەن مردو

بە کارێکی پەسەند دانراوە خۆراك ئامادەبکرێت بۆ خاوەن مردو، لەلایەن کەس و کارو دراوسێیانەوە، وەك پێغەمبەرمان لە کۆچی دوایی جەعفەری ئامۆزایدا فەرمانی کرد: خۆراك بۆ خێزانی جەعفەر دروست بکەن چونکە ئێستا ئەوان لە ڕەوشێکی ئاساییدانین. (احمد و ترمزی وحاکم ریوایەتیان کردووە).

بەم پێیە ناپەسەندە خانەوادەی کۆچکردو خۆراك ئامادەبکەن، بەڵکو خزم و دراوسێ میوان وڕێبوارەکان تێر دەکەن.

## ئەو داب و نەریتانەی لە پرسەدا پەسەند نین

١- پۆشینی پۆشاكی رەش و نیشانەی ماتەمینی.

٢- ریش نەتاشینی هەندێك لە خزم و دۆستانی مردوو، وەك نیشانەی ماتەمینی.

٣- بە فیڕۆدانی سامانێكی زۆر لە ئامادەكردنی خۆراكی زیادە، بەمەبەستی فیزكردن و ناوبانگ و خۆهەڵكێشان.

٤- ماتەمینی لە دوای هەفتەو چلە و یادی ساڵانەی مردودا.

٥- درێژەدان بە ماتەمین لە سەروی سێ (٣) رۆژەوە.

## گفتوگۆ

١- واتای پرسە چییە؟

٢- پرسە و ماتەمینی لە ئیسلامدا چەند رۆژە؟

٣- لەسەر كێ پێویستە خۆراك ئامادەبكات بۆ خاوەن مردو؟

٤- لە پرسەدا چۆن وبەچ دەستەواژەیەك سەرە خۆشی دەكرێت؟

٥- ئەم بۆشاییانە پڕ بكەوە:

سەرە خۆشی دەكرێت لە پیاوان و ........ و ..........، وئامادەكردنی خۆراكی پرسە لە لایەن ......... كارێكی نا پەسەندە.

٦- هەندێك لەو نەریتە نامۆ و ناپەسەندانە بڵێ لە پرسەدا باون؟

## ئادابی فێرکردن

هەر دوو برای گەنج (حەسەن و حوسین) سڵاوی خودایان لێبێت، پیاوێکی بە تەمەنیان بینی بە هەڵە دەستنوێژی دەشوشت، ویستیان بە شێوەیەکی جوان هەڵەکەی بۆ راستکەنەوە، چونکە ئەوە ئەرکی موسوڵمانانە لە نێو خۆیاندا. پێکەوە لە پیرە مێردەکە چونە پێش و پێیان گوت: مامە گیان ئێمە هەریەکە و بەشێوەیەك دەستنوێژ دەشۆین، بەرێزت سەیرمان بکە و شێوازی کام دەستنوێژەت پێ راستبو پێمان بڵێ، تا هەردووکمان پەیڕەوی بکەین. پیاوەکە تێگەیشت لە مەرامی ئەو دوو گەنجەی خانەوادەی پێغەمبەر و هەڵەکانی خۆی راستکردەوە. ئەمە ئەدەبی بنەماڵەی سەروەرمان بوو، پێویستە ئێوەش، قوتابییانی خۆشەویست هەڵەی یەکدی بەشێوەیەکی جوان و پڕ لە رێزو ئەدەب راستکەنەوە. لەم بابەتە فێر دەبین، کە:

١- رێنمایی و ئامۆژگاری موسوڵمانان بکەین و وەرگرین، بۆ کاری پەسەند و فێربونی ئاینەکەمان.

٢- پێویستە مامەڵەی بچوك لەگەڵ گەورە رێزو ئەدەبی تایبەتی هەبێت. هەروەها گەورەش بەسۆز و میهرەبان بێت و بچوك فێربکات.

٣- رەفتاری دروست، با لەمنداڵیشەوە بێت، وەریگرین و پەیڕەوی بکەین.

### گفتوگۆ

١- حەسەن و حوسێن کێن؟ و کامیان گەورە تر بوو لە تەمەندا؟

٢- گرنگی دەستنوێژ بۆ نوێژ چییە؟

٣- دەستنوێژی بە ساڵاچوەکە چۆن بوو؟

٤- ئەگەر کەسێکت بینی نوێژو پەرستشی بە هەڵە ئەنجامدەدا، چی دەکەیت؟

## هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (د.خ) گاوانی کوردی

کاتێك سەرنجی وردی راستییە مێژووییەکان دەدەین، دەبینین گەلانی موسوڵمان تێکڕا بەشدار و خاوەن پشکن لە بنیاتنانی شارستانی ئیسلامدا، بەرێژەی جیاواز، هەر لە دانیشتوانی دورگەی عەرەبییەوە کە لانکی یەکەمی ئەو ژیارە بوو، تا دەگاتە گشت جیهانی بەرفراوانی ئیسلامی، ئەمەش چونکە برایەتی و پەیوەندی باوەڕ هەموانی پێکەوە گرێداوە و هاوکۆشش و خەباتن، بەمەش بوو توانرا سنور و بەربەست و کۆسپ و کێشە لە رێی یەکڕیزی بیروباوەڕدا وەلا بنێن و، رەنگ و زمان و زەوی نەبوە رێگر لە بەردەم پەیوەندی و تەواوکاری و پشتگیری نێوانیان، بەڵکو وەك یەك جەستە وابون، کەهەر ئەندامێکی ژان بکات، سەرجەم ئەندامەکانی شەو بێداری لەگەڵ دەکەن. هەر بەمەش رێگرەکان هەرەس دێنن و قەڵای شارستانی بنیات دەنرێت. ئەوەتا سەلمانی فارسی لەلایەك، بیلالی حەبەشی و سوهەیبی رۆمی وهی دیکەش، ببونە برا و سیفەتی هاوەڵیی پێغەمبەریان هەڵگرتبوو. یەکێك لەو هاوەڵە بەرێزانە (جابان) گاوانی کوردی بوو کە لە کاروانی یەکەمی هاوەڵاندا بوو. چەندین سەرچاوە ئاماژە دەکەن کە زۆر پەیوەست بووە بە پێغەمبەرەوە (د.خ)، بە تایبەت دوای کۆچی پیرۆز و لە شاری مەدینەدا. لەو سەرچاوەنەش پەرتوکی (تفسیر روح المعانی)ی عەلامە ئالوسی ، و پەرتوکی (أُسدُ الغابە)ی ئیبن کثیر، و پەرتوکی (الاصابە في تمییز الصحابە)ی ئیبن حەجەری عەسقەلانی ...هتد. بوونی هاوەڵێکی کورد زمانی وەك (جابان) گاوان لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەرمان (د.خ) نیشانە و بەڵگەی بەهێز بوونی پەیوەندی توندی نیوان گەلی کورد و گەلی عەرەب بووە، تەنانەت پێش هاتنی ئیسلام، جا چ بازرگانی بووبێت یان هاوسێیەتی و ئەم پەیوەندیەش لە سەردەمی بڵاو بونەوەی ئیسلام لە دورگەی عەرەبیدا پەلی هاویشتووە و بەردەوام بووە.

هاوەڵێتی گاوان بۆ پێغەمبەر (د.خ) لە شاری مەدینەدا لە لوتکەدا بوو، بەڵگەش ئەو فەرمودانەن لە بواری ئەحکام و دۆزی کۆمەڵایەتیدا گێڕاوێتیەوە، وەك بواری مارەیی و هی دیکە. چونکە لە سەردەمی قۆناغی مەکییدا بانگهێشتی تەنها بواری بیر و باوەڕی گرتبۆوە، بەڵام لە مەدینەدا زەمینە ساز و لەبار بوو بۆ پەیامی ئیسلام و بناغەی دەسەلاتێکی ئیسلامیی تیادانرا، بەمەش بوار رەخسا بوو بۆ بنیاتنانی ژیارێکی ئیسلامی. بۆیە قۆناغی مەدینە هەلێکی گونجاو بوو، هاوکات لەگەڵ پتەو کردنی بیرو باوەڕ، ئەحکام و مامەڵە و کاروباری نێو کۆمەڵگە رێکبخرێت. (گاوان)ی

کوردی (خ.ر) کوڕێکی لە پاش بە جێما بە ناوی (مەیمون کوردی) کە تا سەردەمی شوێنکەوتوانیش (تابعین) تەمەنی مابوو.

لێکۆڵینەوەکان بەرەو ئەم راستیانەی خوارەوە مان دەبەن سەبارەت (گاوان)(خ.ر):

١- گومان لەوەدا نییە کە (گاوان) (خ.ر) کوردە و لە زۆر سەرچاوە ئەوە دەسەلمێنن، بە تایبەت ئەو دیکۆمێنتانەی دەیسەلمێنن مەیمونی کوڕی کورد بووە.

٢- زمانی عەرەبی بە باشی زانیوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مانەوەی زۆری لە حیجازدا.

٣- گاوان (خ.ر) لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) بوە. زۆر لەگەڵی بوە و فەرمودەی لێوە گێڕاوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر خۆی پاراستووە، لەترسی ئەوەی نەکەوێتە هەڵە لە گواستنەوەی ریوایەت کەمێك لە فەرمودەی گێڕاوەتەوە، هەر چەندە زۆر لە سەروەرەوە نزیك بووە.

٤- چەندین جار فەرمودەی لە پێغەمبەر (د.خ) بیستوە و زۆر جاریش لەگەڵی بوە.

٥- گەلی عەرەب زانیاریان سەبارەت گەلی کورد هەبوە، لە کۆتاییەکانی سەردەمی جاهیلیدا و دواتریش کە ئاینی ئیسلام دەرکەوت، هەروەها زانراوە کە کورد جیایە لە فارس و توران لە ناوچەکەدا، هەر بۆیە بە گاوان گوتراوە گاوانی کوردی و سەلمانیش بە فارسی و...هتد.

٦- لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی لە نێو ژیار (شارستانی) ئیسلامیدا هەر گەلێك تایبەتمەندیی پارێزراو بوە، هەروەها کلتور و داب و نەریتیان. ئەوەتا پایە سەرەکیەکانی ژیاری ئیسلامی کە کورد و عەرەب و توران و فارس بوون وەك خۆیان ماون و پێناسەی نەتەوەییان سەدان ساڵە لە دەست نەداوە.

تێدەگەین کە ئیسلام ئاینی برایەتیی نێوان نەوەکانیەتی لە گەلانی جۆراوجۆر لە لایەك و پێکەوە ژیان و لێك گەیشتن لەگەڵ ئاین و شارستانیەکانی دیکە. لەوەش زیاتر بەڵکو ئاینی تەواوکاری شارستانییە لەگەڵ کۆی مرۆڤەکان، بە پێی ئایەتی قورئان: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)) **(الحجرات١٣)**.

## راهێنانی(١)

وشەی دروست لە نێو کەوانەکان بۆ ئەم دەستەواژانەی خوارەوە هەڵبژێرە:

١- گاوانی کوردی لە (شوێنکەوتوان – هاوەڵان – هاوچەرخانمان) بووە.

٢- گاوان لە حیجازدا (ماوەیەکی کورت – ماوەیەکی درێژ – یەك ساڵ) ژیاوە.

٣- گاوان زۆر (پارێزکار – ترسنۆك – بە چاوچنۆك) بوە.

٤- گەلانی ئیسلام هەموو بەشداریان هەبووە لە (جەنگەکاندا – بنیاتنانی شارستنی ئیسلامدا).

٥- ئیسلام ئاینی برایەتییە لە نێوان (گشت گەلانی ئیسلامدا – بێباوەڕان – دوو رووەکان).

## راهێنانی (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

١- هۆی چی بوو گاوان زۆر فەرمودەی ریوایەت نە دەکرد؟

٢- ئایا عەرەبەکان لە نزیکەوە ئاشنابون بە کورد؟

٣- پەیوەندی سەرەکی نێوان گەلانی ئیسلامی چییە؟

٤- گاوان کوڕێکی هەبوو، ناو و نازناوی چی بوو؟

٥- ناوی سیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) بنوسە کە بەرەگەز عەرەب نەبوون.



## لە هەڵوێستە ناوازەکانی شوێنکەوتو (التابعی) شورەیحی قازی

ئەم پیاوە لە شوێنکەوتوە دیارەکان بوە، لە نێو کەسە وەڵامدەران بووە بە بانگەوازی ئیسلام. پێگەیەکی بڵندی هەبوە لە نێو ئەهلی زانست و دەمڕاستاندا. عومەری کوڕی خەتاب (خ.ر) کردییە قازی شاری کوفە لە عیراقدا، دوای ئەوەی ناوبانگی بە دادگەری لە نێوان خەڵکدا گەیشتەوە خەلیفە. لاپەڕەکانی مێژو پڕن لە هەڵویستەکانی ئەم پیاوە بەڕێزە. وەك لەم روداوەی خوارەوەدا تۆمار کراوە:

دەگێڕنەوە رۆژێك کوڕەکەی پێی دەڵێت: باوە لە نێو من و کۆمەڵێکدا کێشەیەك هەیە، تەماشای دەکەم. ئەگەر راستی لای من بوو ئەوا دادوەریان لەگەڵ دەکەم، خۆ ئەگەر ئەوان خاوەن ماف و راست بوون ئەوا لەگەڵیان رێکدەکەوم. پاشان باسەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، (شورەیح)ی باوکی پێی گوت: برۆ لەگەڵیان ئامادەی دادگابن.

کاتێك هەمووان لە بەردەم دادوەر (شورەیح)دا ئامادەبون دادوەریەکە بە بەرژەوەندی کۆمەڵەکەی بەرانبەری کوڕەکەیدا شکایەوە.

دوای گەڕانەوەی لەگەڵ باوکی بۆ ماڵەوە پێی گوت: بابە ئابڕومت برد، خۆ من پێش وەخت ئاگادارم کردی!

شورەیح گوتی: کوڕم ، سوێند بە خودا لەسەر زەویدا لە تۆ شیرین ترم نییە، بەڵام خودا لە تۆ خۆشەویست ترە لام. بۆیە نەمتوانی نا دادی بکەم. پێشتریش بۆیە پێم نە گوتی ماف بۆ ئەوانە، لەوە دەترسام لەگەڵیان رێکبکەویت و هەندێك لە مافەکانیان بفەوتێت.

ئەمە نمونەیەك بوو لە هەڵوێستی خودا ویستانەی شورەیح (خ.ر).

### گفتوگۆ

١- کەسایەتی شورەیحی قازی وەسف بکە، چۆن بووە؟

٢- هۆی چی بوو خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (خ.ر) کردیە دادوەری کوفە؟

٣- کوڕەکەی چی بە شورەیحی باوکی گوت؟ ئەی باوکی چۆن وەڵامی دایەوە؟

کوڕەکە گوتی: .................. باوکی لە وەڵامدا پێی گوت:................

٤- دوای ئەوەی ناحەزەکانی کوڕی شورەیح داوا کەیان بردەوە، ئەو چی بە باوکی گوت؟ ئەی باوکی چۆن وەڵامی دایەوە؟

کوڕەکەی گوتی: .................. باوکی لە وەڵامدا گوتی: ..................

٥- پەند لەم بەسەر هاتە چییە؟

وانەی سێیەم

## بانگخوازی موسوڵمانی کورد

### سەعید ی نورسی



**لە دایکبونی:** سەعید کوڕی میرزا کوڕی عەلی کوڕی خدر کوڕی میرزا خالیدە. لە ساڵی ( ١٨٧٦)ز لە گوندی ( نورس )ی سەر بە ویلایەتی (بەتلیس) لە رۆژ هەڵاتی ئەنادوڵدا، و لە بنەماڵەیەکی کوردا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. لە سەر دەستی چەندین زانای وڵاتی تورکیا زانستە ئیسلامیەکان و زانیاری سەردەمی وەرگرتوە.

### پێگە زانستیەکەی

ئەم کەڵە پیاوە زیرەکیەکی لەرادە بەدەری هەبوە، هەروەها توانایەکی فرەی بۆ لەبەرکردن و داکردن پێبە خشرا بوو، هاوکات زۆر دانا بوو، هەر بۆیە ببووە زانایەکی بە ناوبانگ و، ناوبانگی هەموو تورکیا، بەڵکو جیهانی ئیسلامیشی گرتەوە، چونکە لە زانستە ئیسلامیە جۆراوجۆرەکاندا شارەزاییەکی فراوانی هەبوو.

زمانەکانی کوردی، تورکی، عەرەبی، بەباشی دەزانی. چەندین شار و ناوچە دەگەڕا لە پێناو بانگەوازی ئیسلام و گەیاندنی پەیامی پیرۆزی. توانی سەرنجی هەزران فێرخواز و زانا بۆ خۆی رابکێشێت، کە کەڵکیان لێدەبینی بۆ وەرگتنی زانستی جۆرا و جۆر و، پەیرەوکردنی بڕێکی زۆر نوسین و پەیامی بڵاوبۆتەوە سەبارەت چەندین جۆری زانست.

## کەسایەتی :

پیاوێکی بوێر و چاو نەترس بوو، لە چەندین بزاڤی رزگاریخواز و بەرهەڵستکاریدا رۆڵی هەبوە. لە رێی کۆڕوکۆبوونەوە، بەشێوەی کردەیی لە رەفتارو نوسیندا توانی بەرگرییەکی باش لە بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، و مافەکانی مرۆڤ بکات. هەر لەبەر ئەوەش کە بانگهێشتی بۆ چاکسازی کۆمەلایەتی دەکرد، رووبەرووی دڕندانەترین شێوازی چەوسانەوە دەبۆوە. چەندین ساڵ زیندان و دەربە دەریی لە سەر دەستی سیستەمی فەرمانڕەوایی ئەو کاتدا گەواهی لەسەر ئەو راستیە دەدەن.

هەڵوێستی مێژویی راستگۆیانە و مەردانەی بەرانبەر فەرمانڕەوا جۆراو جۆرەکانی تورکیا زۆر بوو، سەرەڕای هەڕەشە لێکردن و ناوبەناویش تەماع نانەبەر، بەڵام هیچ دەستبەرداریەکی سەبارەت هەڵوێستەکانی نەنواند، بەڵکو خۆڕاگرو بەهێز بوو، بەشداری لە جەنگی جیهانی یەکەمدا کردووە و بە دیل گیراوە و دواتر توانیویەتی خۆی رزگار بکات، لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا هەوڵی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامی لە ئاستی زانکۆی (ئەزهەر) داوە، بەڵام هەڵگیرسانی جەنگ بۆتە رێگر لە بەردەم ئەم کارە، گرنگی زۆری بەبەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و رۆشنبیری گەلی کوردستان داوە.

لەو پێناوەشدا پەیرەوی خۆی لە ژیاندا گۆڕیوە و لە ژیانی سیاسی دوور کەوتۆتەوە و، دەستی کردووە بە نووسینی (رسائل النور) پەیامەکانی نور کە لە قورئانەوە وەرگیراون، هەزاران قوتابییش لەسەر دەستی پێگەیشتوون و، کۆمەڵەیەکیان بە ناوی (جماعە النور) دامەزراندوە، کە کاری بانگخوازی بووە، کتێبەکانیش بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕدراون، لە وانەش زمانی کوردی.

لە ژیانی وەك باسمان کرد (٢٧) ساڵ لە بەندیخانە بووە، لە ساڵی ١٩٦٠ چۆتە بەر دلۆڤانی خودا، دوای ئەوەی هەزارەها لاپەڕە و هەزاران قوتابی (پەیامەکانی نور)ی بە جێهێشتووە.

## گفتوگۆ

١- سەعیدی نورسی لە کوێ و کەی لە دایکبو؟
٢- لە کوێ خوێندنی درێژە پێدا؟
٣- دیارترین سیمای کەسایەتی نورسی چییە؟
٤- چۆن توانی ناوبانگی جیهانی بە دەست بهێنێت؟
٥- بە هەڵوێستێکی، بەڵگە بێنەوە لەسەر بوێری و چاونەترسی نورس؟
٦- هۆی چی بوو چەندین جار خرایە زیندان و دەربەدەر دەکرا؟

# فەرهەنگ